# نەوژین

ژمارە (٥) یەکشەممە ٢٠١٧/٤/١٦

مانگنامەیەکی تایبەتە بە پرسەکانی ژنان، رادیۆی دەنگ بە پاڵپشتی سندوقی نیشتمانی بۆ دیموکراسی NED ئەمریکی لەگەرمیان دەریدەکات




ئەو ژنە گەرمیانیەی سەدامی دادگایی کرد

2 »«

# ژنانی ئەنفال، بە جەستە ماون و بە رۆح کوژراون

■ نەوژین

**دوای تێپەڕینی ٢٩ ساڵ بەسەر تاوانی ئەنفال دا، تائێستا کۆژان و ئازاری قوربانیانی دەربازبوی ئەو تاوانەو بەتایبەت ژنان بەردەوامە، وەکخۆیان باسیلێوەدەکەن «سەبوریان نایەت».**

بەپێی بەدواداچونێکی (نەوژین)، زۆرینەی ژنانی قوربانی ئەنفال، لەپاش ئەو تاوانەوە نەیانتوانیوە ژیانێکی ئاسایی بژین، بەڵکو هەندێکیان روبەروی نەخۆشی و گرێی دەرونی بونەتەوە، ئەمە سەرباری لێکەوتە جەستەیی و تەندروستیەکانی ئەو پرۆسەیە لەسەریان.

لەوبارەوە (فاتمە عەلی)، کەسوکار ئەنفالکراو، بۆ (نەوژین) وتی: «دوای بیستنی ئەوەی کە باوکم لەگەڵ خاڵۆم و مامم دا زیندەبەچاڵکراون و ئەنفالکراون، توشی نەخۆشی بوم».

وتیشی: «لەگەڵ هەر چواردەی چوارێکدا ئێمە برینمان زیاتر خوێنی لێئەچۆڕێ و سەبوریمان هەرگیزاو هەرگیز نایەت».



کەسوکارێکی ئەنفال لە گۆڕستانی دێبنە — فۆتۆ: دلێر عەبدلرەحمان

شاڵاوی ئەنفال کە رژێمی بەعس بۆ قڕکردنی گەلی کوردستان پیادەی کرد، لەنێوان ساڵانی ١٩٨٧ بۆ ١٩٨٨ ئامادەکاری بۆکراو جێبەجێکرا لەرێگەی ٨ قۆناغەوە کە هەر قۆناغێک ناوچەیەکی کوردستانی گرتەوە.

گەورەترین و پڕ قوربانیترین قۆناغەکانیش، قۆناغی سێ بو کە بە «ئەنفالی سێ» ناسراوە و ناوچەی گەرمیانی گرتبوەوە.

لەم قۆناغەدا نزیکەی (٧٠- ٨٠) هەزار کوردی تێدا بێسەرو شوێن کرا، هەمو گوندەکانی سنوری شاڵاوەکە خاپور کران و چۆڵکران لە دانیشتوانەکەی، سەروەتی باخداری و کشتوکاڵییشیان لەناو بران.

لەلاپەڕەی (٢) دا دۆسیەیەکی تایبەت بە تاوانی ئەنفال دەخوێننەوە.



لەکفری دو هاوسەر پێکەوە نانەواخانەیەک بەرێوەدەبەن

5 »«

## «ژنانی ئاوارەی گەرمیان توندوتیژیان بەرامبەر دەکرێت و سکاڵا تۆمار نەکەن»

■ نەوژین

**رێکخراوێک ئاشکرای دەکات ژنانی ئاوارە لەگەرمیان توندوتیژییان بەرامبەر دەکرێت، بەڵام سکاڵا تۆمار ناکەن، ئەویش بەهۆی لایەنی کەلتورییەوە.**

رێکخراوی هاریکاری یاسایی ژنان، لەچوارچێوەی پرۆژەی چاودێرییکردن و جێبەجێکردنی یاسای بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی خێزانی کە بەپاڵپشتی سندوقی نیشتمانی بۆ دیموکراسی ئەمریکی NED ئەنجامی دەدەن، راپۆرتێکی بڵاوکردوەتەوە کەبەشێک لە داتاو زانیاریەکانی پەیوەندیدارە بەگەرمیانەوە.

لەراپۆرتەکەدا و لەبارەی پرسی توندوتیژییەوە راپرسیەکی بەگشتی ئەنجامداوەو ئاشکرای کردوە زۆرینەی جۆری توندوتیژیەکان کەبەرامبەر بە ژنان دەکرێن لە کوردستان، توندوتیژی دەرونیین، واتا قسەو جێنێو و سوکایەتی وتن بە ژنان.

لەبارەی ئاوارەکانی سنوری گەرمیانیشەوە، راپۆرتەکە ئاشکرای کردوە کەلەماوەی ساڵی رابردودا (٤٠) حاڵەتی توندوتیژی دژ بە ژنان تۆمارکراوە. ئەوەشی وتوە ژنان کێشەو گیروگرفتی کۆمەڵایەتییان هەیە، بەڵام کەمتر پەنا بۆ سکاڵا تۆمارکردن دەبەن، ئەمەش دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی "لەناو کەلتوری ئەوان دا سکاڵاکردن لەسەر یەک شتێکی ئەستەم و نەشازە".

هاوکات سەرپەرشتیاری رێکخراوێک کە کار بۆ ژنانی ئاوارەی گەرمیان دەکەن، جەخت لەو زانیاریانە دەکاتەوە.

ڤیان سابیر، سەرپەرشتیاری پرۆژەکانی رێکخراوی خەڵک بۆ گەشەپێدان، بە (نەوژین)ی وت: «لەکەلتوری بەشێکی زۆر لەو ئاوارانەی لەدەڤەرەکەن و تەنانەت لە هاوڵاتیانی کۆمەڵگەی خۆشماندا، لێپێچینەوەو سزادانی ژنان و ئەشکەنجەدانیان بەشتێکی ئاسایی سەیر دەکرێت».

وتیشی: «زۆرێک لەو ژنانە پێیانوایە کەمافی پیاوە لەهاوسەری خۆی بدات!»





خانەقین، ناوەندی هونەریی زۆر و کچانی هونەرمەندی کەم

7 »«

## ژنانی گەرمیان کەرتی تایبەت دەبوژێننەوە

■ نەوژین

**رێژەی ژنانی ئیشکەر لەگەرمیان رو لە زیادبونەو رۆژ دوای رۆژ ژمارەی ژنانی ئیشکەر بەتایبەتی لە کەرتی تایبەت دا، زیاد دەکات.**

بەپێی بەدواداچونێکی رۆژنامەی (نەوژین)، لەکاتێکدا لەرابردودا زۆرترین پیشەکانی ژنان لەکەرتی گشتی "حکومی" دا خۆی بینیوەتەوە، بەڵام لەگەڵ راوەستانی پرۆسەی دامەزراندنی حکومی و سەرهەڵدانی قەیرانی دارایی، رێژەی روکردنی ژنان بۆ کەرتی تایبەت بەشێوەیەکی بەرچاو زیادیکردوە.

بەوتەی (عومەر محەمەد)، سەرۆکی لقی گەرمیانی سەندیکاکانی کرێکاران و پیشەوەرانی کوردستان، لەئێستادا زیاتر لە ١٨٠ کرێکار و پیشەوەر لە رەگەزی مێ لەلایان تۆمارکراون، ئەمە سەرباری ئەوەی ژمارەیەکی زۆرتر هەن کە خۆیان تۆمار نەکردوە.

ئاماژەی بەوەشکرد: "رێژەی روکردنی ژنان بۆ کەرتی تایبەت لەگەرمیان، بوەتە حاڵەتێکی بەرچاو و رۆژ دوای رۆژ رێژەکەش زیاد دەکات."

باسیلەوەشکرد "داوایان لەحکومەت کردوە هاوشێوەی وڵاتی دیکە، هاوکارییان بکەن بۆ ئەوەی ئاسانکاریی و پاڵپشتیی مادیی ژنان بکرێت بەمەبەستی ئەنجامدان و دامەزراندنی پرۆژەی بازرگانی و ئابوریی، بەڵام بەدەمیانەوە نەهاتون."

لەلاپەڕەی (٥) دا زانیاریی زیاتر لەبارەی برەوسەندنی کارکردنی ژنانی گەرمیان لەکەرتی تایبەت دا دەخوێننەوە.



دۆسیەیەکی تایبەت بە بەزۆر بەشودان

8 »«

# ئەو ژنە گەرمیانیەی سەدامی دادگایی کرد



■ نەوژین،
زریان محەمەد – جوانە جەلیل

**ئەگەرچی تەمەنی ٦٤ ساڵ بو، بەڵام هێشتا بە بوێریی و شانازییەوە ژیان دەکات و ئەو سەربوردەو رۆژانە دەگێڕێتەوە کە پڕن لەناخۆشیی و تاڵی. ئەو بەمناڵی بەخێوکردنی خێزانێکی دەکەوێتە ئەستۆ، پاشان کوردایەتی دەیخاتە کونجی زیندانەوە، هەربەهۆی کوردایەتیشەوە بەر شاڵاوی ئەنفال دەکەوێت و هاوژینەکەی لەدەست دەدات.**

شازادە حسێن، ناسراو بە (شازە)، یەکێک لەو ژنانەی لەدادگاییکردنی (سەدام حسێن)ی دیکتاتۆری عێراق دا بەشدار بو، سەربوردەی ژیانی بۆ (نەوژین) دەگێڕێتەوە.

ئەو دانیشتوی ناحیەی رزگاری سەربەقەزای کەلارە، سەرەڕای نەخۆشی و زۆری تەمەنی و ئەو نەهامەتیانەی کە بەسەریدا هاتوە، هیچ نائومێدیەک لە روخساریدا نەدەبینراو بە پێداگیریی و سەربەرزییەوە چیرۆکی ژیانی خۆی قۆناغ بە قۆناغ باسکرد.

وتی: «لە سەرەتاکانی تەمەنی هەرزەکاریمدا کە دەکاتە (١٣) ساڵ، بەهۆی مردنی دایکمەوە بەخێوکردنی خوشک و براکانم کەوتنە ئەستۆی من و ئیتر ژیانی گەنجێتی خۆمم لە بیرکرد لە پێناو داهاتوی خوشک و براکانمدا».

وەک خۆی دەڵێت: «دو خوشکم کەلە خۆم گەورەتر بون دوای ماوەیەک لە مردنی دایکم ژیانی هاوسەرییان پێک هێنا، تەنها خۆم و سێ خوشک و برایەکم ماینەوە، براکەم لە تەمەنی (١٨)ساڵیدا بەهۆی رژێمی بەعسەوە روی لە شاخ کردو بو بە پێشمەرگە و لە تەمەنی (٢٥) ساڵیدا شەهید کرا».

باسی لەوەش کرد: «بەهۆی بە پێشمەرگەبونی براکەمەوە لە ساڵی ١٩٨٠ خۆم و باوکم و خوشکە بچوکەکەم کە ئەو کات تەمەنی (١٣) ساڵ بو بە جانتا و جلوبەرگی مەکتەبەوە دەستگیر کراین و بردمانیان بۆ بەندیخانەی بەعقوبە».

وتیشی: «خوشکە بچوکەکەم بەهۆی گریانی زۆر و کەمی تەمەنەکەیەوە ئازاد کرا، بەڵام خۆم و باوکم تاوەکو ساڵی ١٩٨٢ لە ژێر فشاری جەستەیی و دەرونی بەندیخانەدا ماینەوە و لە دوای شەهیدکردنی براکەمەوە ئازاد کراین، بەڵام بەهۆی هەواڵی شەهیدبونی براکەمەوە باوکم هەر لە بەندیخانەدا بینای چاوەکانی لەدەست دا، سەرەڕای ئەوەی ئازاد کراین لە دوای لە دەستدانی براکەم، بەڵام هەمو جارێک بانگیان دەکردین بۆ لێپێچینەوە، چونکە هەمومان بە خێزانێکی پێشمەرگە لە قەڵەم درابوین.»

(شازە)، درێژەی بە چیرۆکی ژیانی خۆی و خێزانەکەی داو وتی: «لە دوای ئازاد کردنمان تاوەکو ساڵی ١٩٨٤ هەرسێ خوشکەکەی ترم ژیانی هاوسەرییان پێکهینا و تەنها خۆم و باوکم ماینەوە، لە دوای دو ساڵ خۆشم ژیانی هاوسەریم پێک هێنا، هەروەها لە ساڵی ١٩٨٧ بە هۆی روخانی بەشێک لە گوندەکانی نزیک قەزای کفری و گواستنەوەی ماڵەکان، باوکم لە رێگەدا گیانی لە دەست دا، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە خێزانێکی پێشمەرگە بوین نەماندەتوانی لە باوکم نزیک ببینەوە بۆیە هەر لەوێ خەڵکەکە باوکمیان بە خاک سپارد بە بێ بونی پرسە».

وتیشی: «لە ساڵی ١٩٨٨ بە هۆی شاڵاوی ئەنفالەوە مێردەکەم لە دەست داو کچێکی تەمەن (١٠) مانگی لە دوای خۆی بەجێهێشت.»

دەشڵێت: «حکومەتی بە عس بۆ هەر ماڵیک کە بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتبێت پارچەیەک زەوی پێداین، منیش بە فرۆشتنی زێڕەکانم لەو پارچە زەویە خانویەکی دو ژوریم بۆ خۆم و کچە تاقانەکەم دروست کرد، بۆ دابینکردنی بژێوی ژیانیشمان مەکینەیەکی خەیاتیم کڕی و دەستم بە کاری درومان کرد.»

باسی لەوەشکرد: «بەر لە راپەرینەکەی ساڵی ١٩٩١ لەگەڵ کۆمەڵێک لە هاورێکانمان کۆبونەوەیەکمان ئەنجامدا بۆ چۆنیەتی بەشداریکردنمان لە راپەرینەکەدا، پێشم راگەیاندن ئەگەر لەم راپەڕینەدا سەرنەکەوین ئەوا من ئامادەم خۆم لە ناو ببەم بۆ ئەوەی جارێکی تر نەگەڕێمەوە بەندیخانە، چونکە ئازار و مەینەتی بەندیخانەم چەشتوە.»

(شازە) باس لە دوای ڕاپەرینەکەی ساڵی ١٩٩١ بۆ (نەوژین) دەکات و دەڵێت: «لە ناحییەی رزگاری کۆمیتەی ژنانمان دامەزراند و لە ساڵی ١٩٩٤ تاوەکو ١٩٩٦ ئەندامی کۆمیتە بوم و لە ساڵی ١٩٩٧ بوم بە بەرپرسی کۆمیتەی ژنانی رزگاری.»

وەک خۆی دەیلێت لە ماوەی کارکردنیدا چەندین خولی (تەندروستی و وشیاری و کارکردنیان) بۆ ژنانی ناحییەی رزگاری و دەوروبەری کردوەتەوە، هەروەها پەیوەندیان لەگەڵ رێکخراوە خێرخوازییەکاندا هەبوە بۆ یارمەتیدانی ژنان لەسەرجەم بوارەکاندا.

ئەو باسی لەوەشکرد: «تاوەکو ساڵی ٢٠١٠ هەر لە کۆمیتەی ژنان بوم، بەڵام بەهۆی نەخۆشیەوە نوسراوێکم ئاراستەی دەستەی کۆمیتەکەم کردو پێم راگەیاندن کە کەسێکی بەتواناتر بخەنە جێگەکەم، لەگەڵ ئەوەشدا هەتا لەژیاندابم هەر بەردەوام دەبم لە هاوکاری کردنی ژنان.»

خاتو شازە جگە لە پێشمەرگایەتی و کاری رێکخراوەی و ژنان بەشداری کاری هونەریشی کردوە، لە ساڵی ٢٠٠٩ بەشداری فیلمێکی دیکۆمێنتاری کردوە بە ناوی (کوڕی بابل) بەتەنها و بۆماوەی چەندین مانگ لە زۆربەی پارێزگاکانی عێراقدا ماوەتەوە بۆ تەواو کردنی فیلمەکەی، جگە لەوەش بەشداری چەندین کورتە فیلم و فیستیڤاڵی کردوە لە کوردستان.

هەروەها لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٨ بۆ ٢٠١١ لە سەر توانای خۆی و پاڵپشتی رێکخراوی (هاوکاری ئەلمانی)، ٣ جار سەردانی وڵاتی ئەڵمانیای کردوە بۆ ناساندنی کەیسی ئەنفال بەتایبەت کەیسی ژنان کە لەو شاڵاوەدا چی بەسەر ژناندا هاتوە.

یەکێک لەوێستگە گرنگەکانی ژیانی شازە، بەشداریکردنی بوە لە دادگاییکردنی (سەدام حسێن)ی دیکتاتۆری عێراق. ئەو وەکو یەکەم ژنە گەرمیانی لەگەڵ دو هاورێیدا لە ساڵی ٢٠٠٧ بەشداری دادگای کردنی (سەدام حسێن)ی کردوە لە شاری بەغداد و شایەتیدانی خۆیان لەسەر تێوەگلانی ئەو دیکتاتۆرەو رژێمەکەی لەئەنفال و قەتلوعامکردنی هەزاران هاوڵاتی کورد خستوەتە رو.

لە ئێستادا (شازە) لەگەڵ کچە تاقانەکەی و نەوەکانیدا ژیانی ئاسایی خۆی بەرێدەکات. ئەو لە دوای لەدەستدانی هاوسەرەکەی، جاریکی تر ژیانی هاوسەری پێک نەهێناوەتەوە و هەر لە رزگاری ژیان دەگوزەرێنێت.

---

# ژنانی ئەنفال: لەگەڵ هەر چواردەی چوارێکدا ئێمە برینمان زیاتر خوێنی لێئەچۆڕێ

■ نەوژین، ژینۆ عەلی

**هەرکە پرسیاری ئەنفالمان لێکرد، راستەوخۆ دەستی بە گریان کرد. بەحەسرەتەوە دەستی بە گێڕانەوەی چیرۆکی کوڕە شەهیدبوەکەی کرد، کوڕێک ئەگەرچی لەگەڵ ئەوان دا و لەسەروبەندی ئەنفال دا هەمویان پێکەوە راگوێزراون، بەڵام دواتر ئەو کوڕەو مناڵەکانی لە گۆڕە بەکۆمەڵەکاندا زیندەبەچاڵ کران.**

> لەو کاتەوەی باوکم ئەنفالکراوە بەزۆری شەوان دێتە خەونم

خەدیجە عارف، بۆ (نەوژین) وتی: «کوڕێکم و چوار مناڵی ئەنفالکراون، ئەو دوای ماوەیەک لە نەبیستنی هەواڵی، دواتر خەبەری ئەوەمان پێگەشت کە لەگەڵ خێزان و مناڵەکانی زیندەبەچاڵکراون».

ئەگەرچی زیاتر لە چارەکە سەدەیەک بەسەر کاتی تاوانەکەدا تێپەڕیوە، بەڵام هەتا ئێستاش کەسوکاری قوربانیانی ئەو تاوانە، کە سەربوردەو وردەکاریەکانی ئەنفال دێتە بیریان، خۆیان پێڕاناگیرێت و دەست بە گریان دەکەن.

شاڵاوی ئەنفال کەلەلایەن رژێمی بەعسەوە دەرهەق بە میللەتی کورد کراوە، هەشت قۆناغ و شەش ناوچەی جیاوازی گرتەوە. هەرقۆناغێک لەناوچەیەک ئەنجامدراوە، ناوچەکانیش بریتیی بون لە: (دۆڵی جافایەتی، قەرەداغ، گەرمیان، حەوزی زێی بچوک، دۆڵی نێوچیاکانی شەقلاوەو رەواندوز، بادینان).

گەورەترین و پڕ قوربانیترین قۆناغەکانیش، قۆناغی سێ بو کەبە «ئەنفالی سێ» ناسراوە کە ناوچەی گەرمیانی گرتبووەوەو درێژترین ماوەی هەبو، بەوەی لە٧ی نیسانەوە تاوەکو ٢٠ نیسانی ١٩٨٨ی خایاند.

لەم قۆناغەدا نزیکەی (٧٠- ٨٠) هەزار کوردی تێدا بێسەرو شوێن کرا، هەمو گوندەکانی سنوری شاڵاوەکە خاپور کران و چۆڵکران لە دانیشتوانەکەی، سەروەتی باخداری و کشتوکاڵییشیان لەناو بران.

تائێستاش بۆ کەسوکاری قوربانیانی ئەنفال، وەکچۆن برینێک کەسارێژ بونی نەبێت، بە دەستلێدانێک ئەگەرچی سوکیش بێت، دوبارە خوێنی لەبەر بڕواتەوە، ئەنفال بەوشێوەیە بوە بەبرین لەهەست و نەستی ئەوان دا، کە بەناوهێنانی دوبارە ئازار دەچێژنەوە.

خەدیجە، ئەو ژنەی کوڕەکەی و نەوەکانی لە ئەنفالدا شەهید کراون، بەچاوی فرمێسکاوییەوە کەوتە گێڕانەوەی حیکایەتەکە.

وتی: «ئەو کاتەی ئێمە لە (نوگرەسەلمان) بوین دوای پێنج مانگ لەوێ ماینەوە، گەڕاین بەدوای کوڕە ونبوەکەماندا، بەڵام دەرئەنجامی گەڕانەکەمان دڵخۆشکەر نەبو، بەڵکو ببو بەهۆی ئەوەی جەرگم لەتلەت ببێ و برینم هێندە قوڵ ببو کە هەرگیز سارێژ نەبێ».



دو ئافرەتی کەسوکاری ئەنفال وێنەی قوربانیەکانیان لەباوەش گرتوە فۆتۆ: دلێر عەبدلرەحمان

وتیشی: «هەر لەوێ بیستمان کە لە بیابانەکان دا لەگەڵ مناڵەکانی زیندەبەچاڵ کراون».

خەمی (خەدیجە عارف) هێندە گەورەیە کە هەتا ئێستاش مناڵەکانی تری ئەبینێ فرمێسک بەچاویا دێتە خوارێ و هاوار دەکات «خودایە سەبوری ئەم دڵەم بدە».

خێزان و کەسوکاری ئەنفالکراوان هەتا ئێستاش ئەوەیان لەبیرنەچوەتەوە کە ئەنفال چ کۆستێکی بەسەردا هێنان. ئەوان ئەگەر شەهید نەکرابێتن، ئەوا لەروی دەرونییەوە بەتەواوی تێکشکێنراون، تەنانەت هەندێکیان توشی نەخۆشی دەرونی بون.

فاتمە عەلی، کەسوکار ئەنفالکراو، بۆ (نەوژین) وتی: «دوای بیستنی ئەوەی کە باوکم لەگەڵ خاڵۆم و مامم دا زیندەبەچاڵکراون و ئەنفالکراون، توشی نەخۆشی بوم».

وتیشی: «لەدەستدانی کەسی ئازیز برینێکە هێندە قوڵە مرۆڤ بەزۆر ئەتوانێ خۆڕاگربێ، جابگا بەوەی کە بەشێک لە رۆحیەتت بەزۆری و بەزیندویەتی لەخاک نرابێ».

وتیشی: «لەو کاتەوەی باوکم ئەنفالکراوە توشی نەخۆشی بومەو بەزۆری باوکم شەوان دێتە خەونم، لەگەڵ هەر شانزەی سێیەک و چواردەی چوارێکدا ئێمە برینمان زیاتر خوێنی لێئەچۆڕێ و سەبوریمان هەرگیزاو هەرگیز نایەت».

# تاوانێک لە بێدەنگی و نهێنی دا...

## چیرۆکی ئەو کچانەی لەلایەن کەسوکاریانەوە دەستدرێژییان دەکرێتە سەر

■ نەوژین، گوڵباخ حەسەن

**دەستدرێژیکردنە سەرکچان لە لایەن کەسوکاری خۆیانەوە، هەتا ئێستا بەوەناسراوە کە حاڵەتن و ناوەناو بێدەنگیان لەبارەوە دەشکێنرێت، بەڵام بەشێکی زۆری ئەم تاوانەی کەدەکرێت هەر لە نهێنی و بێدەنگی دا دەمێننەوە، کچانی قوربانی لەترسی تاوانبار یان دابونەریتی کۆمەڵایەتی و یاخود لۆمەی کۆمەڵگە، دەنگ لەئاست ئەم تاوانە بەرز ناکەنەوەو لەدڵی خۆیاندا دەیهێڵنەوە، ئەمەش وادەکات تاوانباران دەرباز ببن، قوربانیەکانیش لەروی دەرونی و کەسێتیەوە تێکبشکێن.**

لەمیانەی ئەم راپۆرتەوە، چەند نمونە و چیرۆکێکی ئەم تاوانە دەگێڕینەوە، کەبێگومان بەلای زۆرمانەوە چیرۆکەکان توشی شۆک و سەرسوڕمان و دڵتەنگیمان دەکەن.

### کاتێک باوک دەبێتە دڕندە!

چیا، ناوی خوازراوی ژنێکی تەمەن ٢٥ ساڵە. بەمناڵی تا تەمەنی ١١ ساڵی لای نەنکی ژیاوەو دوای ئەوەی نەنکی کۆچی دوای کردوە، هاتوەتەوە لای دایک و باوکی.

ئەو بەمشێوەیە باسی لە چیرۆکەکەی خۆی کرد:

«باوکم زۆر سەیر خۆشەویستی و گرنگی بەمن دەدا، ماچی دەکردم و لەباوەشی دەگرتم و هەندێک هەڵسوکەوتی سەیری دەنواند! من لەمەبەستی ئەو نەدەگەیشتم، بێ ئاگابوم لەوەی کە دەیەوێت دەستدرێژیم بکاتە سەر.

باوکم منی وا تێ گەیاندبو کە شتێکی ئاساییەو هەموو باوک و کچەکان وان، کێشەکە ئەوەبو دایکم نەخۆشی دەرونی هەبو چەند جارێک بەیەکەوە دەیبینین زۆر لەلای ئاسایی بو، بەو شێوەیە بەردەوام بو، لە دایکم زیاتر لەگەڵم بو.

ئەم حاڵەتە وایکرد براکەشم چاو لە باوکم بکات، ئەویش گێچەڵی پێدەگرتم و دەیوت چۆن بۆ باوکم ئاساییە دەبێت ڕێگەش بەمن بدەی سێکست لەگەڵ بکەم.

لەتەمەنی چواردە ساڵی کوڕێکم ناسی دراوسێمان بو خۆشیدەویستم. حاڵەتەکەی خۆمم بۆباسکرد ڕێنمایی کردم بڕۆم سکاڵا بکەم. منیش بەیانیەکی زو سکاڵام کرد و کێشەکەی خۆمم بۆ باسکردن، هەواڵەی سەنتەری داڵدەدان و ڕێکخراوێک کرام. هەرکەسم دەبینی ڕێنمای ئەوەیان دەکردم کە کێشەکە ببڕدرێتەوە، چونکە هەم لە روی کۆمەڵایەتیەوە کێشەیەو هەمیش بۆ داهاتوم باش نابێت. دواتر لەشێڵتەر مامەوە تاپیاوێکیان بۆ دۆزیمەوەو لەویان مارەکردم کە تەمەنی ٢٠ ساڵ لەمن گەورە تربو. بەو حاڵەشەوە باوکم وازی لێنەدەهێنام، چەندینجار ئەهاتە سەرم و قسەی ناشرین و سوکایەتی پێدەکردم، ئەیویست واز لەمێردەکەم بهێنم و بڕۆمەوە لای ئەوان. وایلێهات مێردەکەمیش منی نەویست، دوای دو مناڵ دەریکردم، لەو کاتەوە تائێستا من دەربەدەرم و هەر رۆژەو لەشوێنێکم.»

چیا، ئەوەی وت: «هەموو ئەو نەهامەتیانەی لە ژیانماندا توشم بوە، لەو کاتەوە دەستیان پێکرد کەباوکم دەستدرێژی کردە سەرم و یاساش هاوکار نەبو بۆ بە بەسزا گەیاندنی».

دەشڵێت: «هەمیشە ئەو پرسیارە بێ وەڵامە لەمێشکم دایە: بۆ باوکم دەستگیرنەکرا؟ بۆچی کەسانی ناو یاساش لەگەڵ لێخۆشبونی باوکم بون؟!»

### ئەمجارەیان مام دەبێتە دڕندە

ئەوین، تەمەنی ١٧ ساڵە، دوای لەدەستدانی باوکیان، مامی ئەرکی سەرپەرشتیکردن و بە خێوکردنیانی لەئەستۆ گرتوە. چیرۆکی ئازار و کارەساتی ئەو، لەو رۆژەدا دەست پێدەکات کە کاتێک دایکی لەماڵ دەرچوەو مامی ئەمەی بەهەلزانیوەو هەوڵی دەستدرێژیکردنەسەری داوە.

چیرۆکەکەی بەمشێوەیە درێژەپێدا:

«قوفڵ کردنی دەرگاکەو شێواوی دەموچاوی مامم بۆمن زۆر مایەی پرس بو، لەوە شۆک تر هاتنە پێشەوەو پەلاماردانم بو وەک گورگی برسی. منیش بەهەمو هێز و توانامەوە هاوارم کردو بەرگریم کرد، نەمهێشت ئەنجامەکەی بپێکێت، هیچ نەوەستام تاخۆمم گەیاندە لای دایکم و هەمو شتێکم بۆ باسکرد. راستەوخۆ پیوەندیمان بەلایەنی پیوەندیدارەوە کرد، لیژنەیەکیان دروست کرد، بەڵام لەبەر دڵی دایکم و قسەی خەڵک بەناچاری و بەمەرج لێی خۆش بوم».

ئەوین وتی: «ئێستا متمانە بەهیچ پیاوێک ناکەم، دیمەنەکان و وێنەی ئەو لەحزەیەی مامم پەلاماری دام، هەمیشە لەپێش چاومن، دایمە ئەڵیم ئاخۆ چەند کچی تر هەبێ و بەو شێوەی من دەستدرێژی کرابێتە سەری و لەترسا بێدەنگی نواندبێت و وەک من جورئەتی نەبێت و تاوانەکەی پەردەپۆش کردبێت؟!»

### دەستدرێژی بۆسەر کچێکی تەمەن ٤ ساڵان!

سوهام، ژنێکی تەمەن ٢٩ ساڵ بو. لەیەکێک لە نوسینگەکانی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی، سەرقاڵی بەدواداچون بو بۆ ئەو سکاڵایەی لەبەرامبەر دەستدرێژی کردنە سەر کچە تەمەن چوار ساڵانەکەی لەلایەن مێردی خوشکەکەی کەتەمەنی ٣٠ ساڵ بو، تۆماریکردبو.

ئەو چیرۆکەکەی بەمشێوەیە گێڕایەوە:

«خوشکەکەم و مێردەکەم میوانمان بون، ئێمە سەرقاڵی کارکردن بوین نزیکەی کاتژمێر١١ی شەو بو کچەکەم خەوی لێکەوتبو، کاتێک چومە ژورەوە بینیم مێردی خوشکەکەم پیجامەی کچەکەمی داکاندوەو خەریکی تەحروشکردنە پێی، ئەو دیمەنەم بینی حەپەسام و لەهۆش خۆم چوم، دوای ئەوەش ماڵ و هەمو شتێکم لەبەرچاو کەوت وکچکەشم ترساوەو بەردەوام رائەچڵەکێت. دوای سکاڵاکردنیش کێشەی کۆمەڵایەتیم بۆ دروستبوەو کەسوکارەکەم زۆرم لێدەکەن لێی خۆشبم و ئازادی بکەم، بەڵام من هێشتا سورم لەسەر سکاڵاکەم.»

ئەو ژنە هەروەها وتی: «کەسوکارم هەڕەشەی ئەوەم لێدەکەن کە ئەگەر لێی خۆش نەبم حاشام لێدەکەن، ئێستا من نازانم چۆن قەراری لێخۆش بون بۆ کەسێک بدەم کە بێبەزەیانەو لە ماڵی خۆم دەستدرێژی کردوەتە سەر مناڵێک؟»

وتیشی: «دوای ئەو روداوە تەنانەت ناهێڵم مێردەکەمیش کچەکەم لەباوەش بگرێت، بەهۆی ئەوەی من بینیم هەرچی پیاوی دنیا هەیە لەبەر چاوم کەوتون، زریکەی کچەکەم و ئەو شەوەم هەرگیز بیرناچێتەوە».

### مێردی پورم، ژیانی وێران کردم

نەسرین، ٣٥ ساڵ، قوربانیەکی دیکەی دەستدرێژییکردنە، کە ئەم لەلای مێردی پوریەوە دەستدرێژی کراوەتە سەر، روداوێک کە سەراپای ژیانی وێران کردوەو چارەنوسی بۆ هەمیشە سوتاندوە.

چیرۆکەکەی بەمشێوەیە بۆ (نەوژین) گێڕایەوە:

«دوای مردنی دایک و باوکم، لەتەمەنی ٩ ساڵییەوە پورم ئەرکی بەخێوکردنی منی گرتە ئەستۆ کە ماڵیان لەلادێ بو، ئیتر منیش وەکو دایک و باوکی خۆم سەیری پورم و مێردەکەیم دەکرد.

تەمەنم ١٢ ساڵ بو، هەرگیز ئەو رۆژەم بیرناچێت لای ئاژەڵەکان بوم، مێردی پورەکەم کەتەمەنی ٥٠ ساڵ دەبو، هات بۆلام و هەردوکمان بە تەنیابوین. پێیوتم: وەرە پشتم بشێلە. هەر ئەوەندەم زانی هەردو دەستی توند گرتم و رایکێشام و دەستدرێژی کردە سەرم.

ئیتر بەو شێوەیە بەردەوام لەژێر ترس و هەڕەشەی کوشتن ئەوەی بەمن دەکرد، چوار ساڵ بەوشێوەیە بەردەوام دەستدرێژی دەکردە سەرم، بەوشێوەیە نەفسیەتی تێکدابوم و و ئیدمانی کردبوم و نەمدەتوانی بەسەر خۆم دا زاڵ ببم، خەڵکی تریش فێرم بون.

لەتەمەنی ١٥ ساڵی و دوای چوار ساڵ، پورم بەمەی زانی کەمێردەکەی لەگەڵ منە، دەریکردم و ئازاری زۆریدام، دواتر هەرخۆێ پیاوێکی پیرو کەمئەندامی بۆ دۆزیمەوەو منی بەشودا. دوای سێ مناڵ مێردەکەم زۆر ئازاریدەدام، جارێک بەفیشەک قاچی شکاندم، دواجار دەری کردم و کەوتمە سەر جادە».

نەسرین، دەڵێت: «بەخۆم ئەڵیم چی دەبو ئەگەر وەکو مناڵانی تر دایک و باوکم هەبوایە و نەکەوتمایەتە بەر نەفسی پیسی پیاوێکی دڕندە و ئەم شێوە ژیانەم نەبوایە؟!»

دەشڵێت: «ئێستا زۆر دڵم لای مناڵەکانمە، دایمە ئەڵێم من بێ دایکی ئاوای بەسەرهێنام، ئەی ئەبێت مناڵەکانم چ ئایندەیەک چاوەڕوانیان بکات؟!»

### براکەم بو بە دێوەزمەی ژیانم

شێوە، ناوی خوازراوی مناڵێکی تەمەن ١٣ ساڵە، بەهەڵسوکەوت و گۆشەگیرییەکەیەوە، دیارە کە خاوەنی گرێیەکی دەرونی قوڵە. چیرۆکی خۆی بەمشێوەیە بۆ گێڕامەوە:

«براکەم زۆر نزیکم ئەکەوتەوەو هەڵسوکەوتی زۆر سەیر بو لەگەڵم، هەرگیز پێشوتر ئەم هەڵسوکەوتەم لەو نەبینیبو، بۆیە ئەمە ترسی لەلام دروستکردبو، بە شێوەیەک وەک مۆتەکەی لێهاتبو و شەوانەش دەهاتە خەوم.

هەموو ئەم قسەوباسانەم بۆ دایکم گێڕایەوە بەئومێدی هاوکاریکن و چارەسەرکردنی کێشەکەم، کەچی ئەو توند بەدەستی کێشای بەدەمم داو تفی لێ کردم و نەیهێشت قسەکانم تەواو بکەم!»

### با یەکەم هەنگاو لەخۆمانەوە دەست پێبکەین

کێشەی دەستدرێژی کەسانی نزیک، رەنگە بەو زەقییە بونی نەبێت، بەشێکیشی پەیوەندی بەوەوە هەیە کە کێشەکان زۆرتر بەنهێنی دەمێننەوە، بەڵام ئەوەی پێویستە ئەنجامی بدەین ئەوەیە کە بەهەمومانەوە روبەروی ئەم حاڵەتە بوەستینەوە، بۆ ئەوەی خوشک و مناڵ و کەسەکانمان، ژیانیان بەدەردی ئەو قوربانیانە نەچێت کە چیرۆکەکانیانمان لەسەرەوە گێڕایەوە. منیش لای خۆمەوە، یەکەم هەنگاوی کرداریم نا!

یەکەم هەنگاوی کرداریشم ناساندنی (شێوە) بو بە توێژەرێکی دەرونی دڵسۆز، بۆ ئەوەی ئێمەی رۆژنامەنوس هەر رۆڵی خستنەروی کێشەکان نەبینین و بەشێک بین لەبەرگرتن بەم تاوانەی کەدەکرێت. توێژەرەکەش خۆشبەختانە دایکی بانگهێشتکردبو و لەکێشەکە ئاگاداری کردبوەوەو چارەسەریان کردوە. ئێستا (شێوە) تاڕادەیەک دەرونی ئارامە، بەڵام هێشتا ترس و دڵەراوکێ لەوەی بەسەری هاتوە، بەتەواوی لەدەرونی دا نەڕەویوەتەوە.

> هەموو ئەو نەهامەتیانەم توش بوە، کەچی یاساش هاوکارم نەبو

> ئەوەی من بینیم هەرچی پیاوی دنیا هەیە لەبەر چاوی خستوم



### جاران جەستەیان سوتا بو، ئێستا روح و دەرونیان

# ئەو کچانەی بەشێکی جەستەیان سوتاوە ژیانی سەخت دەگوزەرێنن

■ نەوژین، ژینۆ عەلی

**(گوڵان)، کەبەشێک لە روخساری سوتاوە، هەم ئازاری جەستەیی و هەم دەرونی ئەچێژێ، هەندێکجار هێندە جاڕس ئەبێت، دەڵێت: «بریا هەر ئەو کاتەی بەشێک لەجەستەم سوتا، هەمو جەستەم سوتابایە».**

گوڵان، (٢٣) ساڵ، بۆ (نەوژین) وتی: «لەکاتی دروستکردنی خواردنا بو، لەپڕ غازەکەمان تەقیەوەو بەشێک لەجەستەمی سوتاند».

ئەو وتیشی: «هەرچەند دەرمانم بەکارهێنا بۆئەوەی سوتاوییەکە بەجەستەمەوە نەمێنێ، بەڵام سودی نەبو، هەرئەوەش بوەتە رێگریەکی گەورە لەبەردەم ژیانم دا».

زۆرینەی ئەو کچانەی کە توشی حاڵەتەکانی سوتان دەبن، دوای روداوەکە روبەروی ژیانێکی ناخۆش و ناسەقامگیر دەبنەوە. ئەوان ئەگەر بەخۆسوتاندن بێت یان بە سوتان بێت، جەستەو روخساریان توشی شێواویی دەبێت، ئەمەش وادەکات نەتوانن بە ئاسایی ژیان بکەن.

ئەوان ئەگەرچی دەربازیان لە ئازارە جەستەییەکان بوە، بەڵام بەهۆی لێکەوتەو شوێنی برین و سوتاویەکەی سەر جەستەیان، ناتوانن وەکو کەسانی دیکە ژیان بکەن، بەڵکو ئەمە دەبێتە گرێیەک لە ژیانیان دا.

گوڵان، ئەوکچەی کە غازی پێدا تەقیەوەو بەشێکی جەستەی سوتا، لەکاتی گێڕانەوەی چیرۆکی سوتاوییەکەیدا، وەک ئەوەی دەستکاری برینێکی ساڕێژنەبو بکەی، ئازار دایدەگرت و دەستی بەگریان دەکرد.

بەدەم گریان و هەڵڕشتنی فرمێسکەوە، ئاماژەی بەوەکرد «لەئێستادا ئازاری جەستەم نیە، بەڵام دەرونم هێندە ناموڕتاحە کە دەڵێم بریا ئەو کات تەواوی جەستەم سوتابا و لەم ئازارەی ئیستە دەربازم بوایە».

ئەو کچانەی کە روبەروی ئەم حاڵەتە دەبنەوە، هەندێکیان ناچار دەبن دەستبەرداری ژیانی ئاسایی و خەون و خولیاکانیان بن و لەکونجی ماڵەوە بخزێن.

محەمەد ئیبراهیم، توێژەری کۆمەڵایەتی، بۆ (نەوژین) وتی: «ئەو ئافرەتانەی کە بەهۆی روداوێکەوە یان سوتانەوە روخسارییان تێکچوە، توشی بارێکی دەرونی ئاڵۆز دەبن و هەست بەکەمی و شەرم دەکەن و ئەگەری دورە پەرێزی و دورکەوتنەوەیان لە کۆمەڵ زیاترە».

(دەرون)، کچێکی ترە و بەشێک لە روخساری سوتاوە. لەوبارەوە دەڵێت: «من تەمەنم شانزە ساڵان بو کاتێک توشی ئەم سوتاوییە بوم، هەندێکجار مناڵان لێم دەترسێن و کەئەمبینن هاوار ئەکەن، ئەمەش بۆ من زۆر ناخۆشە، بۆیە بەکەمی دەچمە دەرەوەو تەنانەت وازم لەخوێندنیش هێناوە».

یەکێک لەگەورەترین ئەو کێشەو خەمانەی کە روبەروی ئەم کچانە دەبێتەوە، ئەوەیە کە قورس و گرانە بۆیان ژیانی هاوسەری پێکبهێنن. باسلەوەدەکەن کە هەندێکجار خەڵکی توانجی ئەوەیان لێدەدەن کە بۆچی هاوسەرگیریی ناکەن، بێ ئاگا لەوەی کە بەهۆی سوتاویی جەستەیانەوە ناتوانن ئەو کارە بکەن.

دەرون، بۆ (نەوژین) دەڵێت: «من کەبەشێک لە روخسارم سوتاوە ناتوانم بەهیچ جۆرێک دایبپۆشم، ئەوانەی کە بەشێک لە جەستەیان سوتاوە ئەتوانن بە جلێک دایپۆشن، بەڵام من ئەوەش ناتوانم».

بەوتەی محەمەد ئیبراهیم ی توێژەری کۆمەڵایەتی، بەشێکی زۆری خەم و تەرکیزی ژیانی ئەو کچانەی کە توشی سوتان هاتون، دەبێتە ئەوەی چۆن ئەو جێ سوتاویە چاک بکەنەوە.

وتی: «ئەو کچانە هەستی متمانە بەخۆبونیان کەم دەبێتەوە و زۆرترین بیرکردنەوەکانیان لە جوانترکردنی روخساریان دەبەنەسەر، لە پرۆسەی هاسەرگیریشدا رەنگە توشی گرفت ببنەوە».

ئەم وتەیە، (گوڵان)یش جەختیلێکردەوە و وتی: «هەندێکجار ئارەزو دەکەم جلێک بپۆشم، بەڵام بەهۆی ئەوەی جەستەم سوتاوە، ناتوانم لەبەری بکەم، ئەمەش توشی بێئومێدیم دەکات و خۆزگە دەخوازم کە وەکو هەرمرۆڤێکی ئاسایی بمتوانیبایە هەمو ئەو جلانە لەبەر بکەم کە ئارەزوم لێیانە».



### زۆرینەیان تاکە سەرچاوەی ژیانیان موچە کەمەکەیان بوە

# حکومەت بێوەژن و هەتیوباران نانبڕاو دەکات



بێوەژنانی گەرمیان لە چاوەڕوانی وەرگرتنی موچەکانیان

■ نەوژین، پەیام لەتیف

**ئەگەر نەمانی هاوسەرەکانیان خەمێکی گەورە بێت یان جیابونەوە لەهاوسەرەکانیان بەشێکی کێشەکانیانی چارەسەرکردبێت، ئەوە بڕینی موچەکانیان لەروی مادییەوە هێندەی تر ژیانی بێوەژنەکانی سەختکردوە.**

ئەوان پێشتر دو مانگ جارێک ٣٠٠ هەزاریان وەردەگرت، بەڵام ماوەی ساڵ ونیوێکە هیچ موچەیەکیان پێنادرێت.

بەشێک لەوان دوای کۆچی دوای هاوسەرەکانیان خەمی بەخێوکردنی منداڵەکانیان بو بەوەی پێویستیان بەکەس نەبێت، بەڵام ئێستا وەکخۆیان دەڵێن ئەوان پێویستیان بەمنداڵەکانیانە سەرەڕای ئەوەی هاوسەرگیریان کردوە.

زوهرە نیزامەدین، (٥٥) ساڵ، ماوەی دە ساڵە هاوسەرەکەی لەدەستداوە. ئەو دانیشتوی ناحیەی رزگاریەو خاوەنی شەش مناڵە، ئێستا لەگەڵ سێ لەمنداڵەکانی دەژی. وتی: «لەدوای بڕینی موچەکەم دابینکردنی بژێوی ژیانمان قورسبوە، کوڕەکانم کەهاوسەرگیریان کردوە یارمەتیمان دەدەن بۆئەوەی ژیانمان لەئێستا قورستر نەبێت.»

بەپێی ئاماری بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاودێری و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی گەرمیان، لە سنورەکەدا (٣٤٥٧) بێوەژن هەیە. گەورەترین کێشەی بێوەژنەکان لەدوای بڕینی موچەکانیان خراپی دۆخە ئابوریەکەیانە کە خۆشیان ناتوانن هیچ کارێک بکەن.

حەلیمە رەشید، (٦٢) ساڵ، لەگەڵ دو کچی لە شارەدێی گردەگۆزینەی کەلار ژیان بەسەردەبات. وتی: «جگە لەو موچەیە هیچ داهاتێکی ترم نەبو، لەگەڵ بڕینی موچەکەشم ژیانمان بەقورسی بەڕێوەدەچێت، ئێستاش باری ئابوریمان باش نیە و خۆشم توانای کارکردنم نیە.»

لەساڵی (٢٠١٣)ەوە هیچ مامەڵەیەکی چاودێری خێزان لە گەرمیان وەرنەگیراوە کە کەسێک بتوانێت سودمەندبێت، ئیتر بێوەژنان بن یان هەر توێژێکی تر کە تۆڕی پاراستنی کۆمەڵایەتی و خێزان دەیانگرێتەوە.

بەشێک لەو بێوەژنانە جیابونەتەوەو لەگەڵ ماڵی باوکیان دەژین، بڕینی موچەکانیان وایکردوە ببنە بارگرانی بەسەر ئەوانەوە، ئەمەش هەستێکی ناخۆشی بۆ دروست کردون.

(هـ . ک)، (٤٠) ساڵ، ماوەی (١٢) ساڵە لەهاوسەرەکەی جیابوەتەوە و لەگەڵ ماڵی باوکی دەژێت. بۆ (نەوژین) وتی: بڕینی موچەکەم کاریگەری زۆری هەبوە لەسەر ژیانم، چونکە هیچ موچەیەکی ترمان نیە، بەهۆی تەمەنەوە باوکم ئێستا هیچ کارێک ناکات.

وتیشی: «باری ئابوریمان باش نیە ئەو موچەیە بۆ من زۆر باشبو، دەمتوانی پێداویستیەکانی خۆمی پێدابین بکەم.»

لەبەرامبەر ئەم هەمو داواو رەخنەو گلەییەی توێژی بێوەژنان، بەڕێوەبەری گشتی چاودێری و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی گەرمیان، ئاماژە بەوەدەکات کەتائێستا نازانرێت کەی و چۆن ئەو موچانە دەدرێنەوە.

دەرون عومەر، بە (نەوژین)ی وت: «لەئێستادا کڵێشەی فۆرمێک لەوەزارەتی کاروباری کومەڵایەتی بەراوێژ لەگەڵ بانکی نێودەوڵەتی ئامادەکراوە، سەبارەت بە پشتگیریکردنی ئەوکەسانەی کەسودمەندن لەبەشی چاودێری خێزان کەبێوەژنەکانیش دەگرێتەوە، لەبارەی زانینی ئاستی بژێوی وئاستی سەرچاوەکانی ژیانیان، لەدوای دیاریکردنی ئاستی بژیویان بڕیار لەسەر بەردەوامبون یان بڕینی موچەکانیان دەدرێت».




سەبارەت بەوەی سیستەمی بایۆمەتری کە بێوەژنانیش دەگرێتەوە، (دەرون عومەر) وتی: «بیوەژنەکانیش وەکو هەمو فەرمانبەران روپێوی بایۆمەتریان بۆ دەکرێت بۆ ئەوەی بزانرێت موچەی تریان هەیە یان نا، چونکە هەرکەسێک لەچاودێری خێزان سودمەندبێت نابێت موچەی تری هەبێت».

بەشێکی تر لەو بێوەژنانەی جیابونەتەوە منالیان هەیەو لەگەڵ ماڵی باوکیان دەژین دوای بڕینی موچەکانیان ژیان بۆئەوان دو هێندە سەختبوە، چونکە خۆیان ئەرکی بەخێوکردنی منداڵەکانیان گرتوەتە ئەستۆ.

یەکێک لەوبێوەژنانەی کەناوەکەی لای (نەوژین) پارێزراوە، خاوەنی ٣منداڵەو لەگەڵ ماڵی باوکی دەژێت. دەڵێت: «دوای جیابونەوەم لەهاوسەرەکەم، خۆم مناڵەکانم بەخێودەکەم، بەڵام ئێستا ناتوانم وەکپێویست ئەو شتانەی داوای دەکەن بۆیان جێبەجێ بکەم، ئەمەش ئازارم دەدات».

# لەکفری دو هاوسەر پێکەوە نانەواخانەیەک بەڕێوەدەبەن



**(سەمەد ئەمین) و (رووناک محەمەد) لە کاتی کارکردندا**

**▪ نەوژین، ئەشرەف ئەحمەد**

**ئیشکردنی پیاوان لەشوێنکارەکاندا دیمەنێکی ئاسایی و دوبارەیە، رەنگە تاڕادەیەک ژنانیشمان لەشوێنکارەکاندا بینیبێت، بەڵام دیمەنی دو هاوسەر کە پێکەوە لە شوێنکارێک دا کاربکەن لەگەرمیان، دەگمەن و کەم بینراوە. دو هاوسەر لەقەزای کفری، توانیویانە ئەم کۆتە بشکێنن و پێکەوە ماوەی نزیکەی ٩ ساڵە، دوکانێکی نانەوایی «نانەواخانە» بەڕێوەدەبەن و بژێویی خێزانەکەیان پەیدا دەکەن.**

(سەمەد ئەمین) و (رووناک محەمەد)، دو هاوسەری دانیشتوی قەزای کفرین. ئەوان کە بڕیاریانداوە هاوبەشی ژیانی یەک بن، لە ماڵەوەو دەرەوەشی دا، ئەو بڕیارەیان پەیڕەو کردوە. رۆژانە بەیەکەوە نانەواخانەیەک لە گەڕەکی «ئەوبەری» شارە دێرینەکە بەڕێوەدەبەن. وەکخۆیان دەیڵێن: ئێمە پێکەوە و بۆ یارمەتی دانی یەکتر کاردەکەین.

سەمەد، کە تەمەنی ٦٢ ساڵە، لەوبارەوە بۆ (نەوژین) وتی: «پێویستی ژیان و ئەرکی باوکایەتی و دایکایەتی، وایلەئێمەکردوە کە دەست بدەینە ئەم پیشەیە، لەم رێگەیەوە لەخوا بەزیاد دەتوانین بژێوی خۆمان پەیدا بکەین». وتیشی: «بە رەنجی شانی خۆمان نان دەردەکەین و ئامادەنیمان دەست لەم و لەو پان بکەینەوە، ئەمە ئیشی شەرەفە دەیکەین، لەخوا بەزیادبێت ئیشەکەین و حاڵمان باشە».

(روناک)یش، هاوبۆچونی هاوسەرەکەی بو بەوەی سەربەرزن بەم کارەیان و پێکەوە دەتوانن بژێوی ژیانی خێزانەکەیان پەیدا بکەن، کە لە خۆیان و شەش منداڵ پێکدێت.

بۆ (نەوژین) وتی: « بژیویمان لەسەر ئەم کارەیە، هەرچەندە زۆریش هیلاک دەبین، بەڵام مورتاحین و رۆژانەش چەندمان دەستبکەوێت سوپاسگوزارین».

ئیشکردنی ئەم دو هاوسەرە لە نانەواخانەکەیاندا، بە هاوبەشی و هاوکارییە، ئەوان لەنێوان خۆیاندا ئەرک و کارەکانیان دابەش کردوە.

سەمەد، لەوبارەوە وتی: «هاوسەرم زۆرتر کاری هەویر گرتنەوەو گونک کردن ئەنجام دەدات، منیش پێوەدانی بە تەنورەکەو ئاگاداربون لە برژاندنی و هەروەها فرۆشتنی بە کڕیارەکان لە ئەستۆمە». وەکخۆیشی وتی: «پێکەوە بە باشیی کارەکەمان ئەنجام دەدەین».

زۆرێک لەپیاوان بەتایبەتی ئەوانەی کە بە «نەوەی کۆن» هەژمار دەکرێن، کارکردنی ژنانیان بەلاوە پەسەند نیە، بەڵام ئاخۆ چی وایکردوە (سەمەد) پێچەوانەی نەوەکەی بیر بکاتەوە؟

لەوەڵامدا دەڵێت: «پیاو لەگەڵ ژن ئەبێت جۆرە رێکەوتنێکی هەبێت، چونکە چەپڵە بەیەک دەست لێ نادرێت ئەگەر بمانەوێت بە خۆشگوزەرانی بژین».

یەکێک لەو خاڵانەی کە ئەو دو هاوسەرە نیگەران دەکات، توانجی خەڵکی و دەستوەردانیانە لە ژیانیان، بەتایبەتی کە زۆرجار تانەیان لێدەدەن و پێیان دەڵێن دەستبەرداری ئیشەکەتان بن.

(سەمەد) لەوبارەوە وتی: «خەڵک تانە و تەشەر دەدەن، بەڵام من گوێم لە خەڵک نیە، من بەشەرەفم بە ئیشەکەم». (روناک)یش جەخت لە قسەکانی دەکاتەوە و دەڵێت: «خەڵک زۆر قسە دەکەن و تەداخولی ژیانمان دەکەن دەڵێن بەسە و وازبێرە پشتت شکا و هیلاکیت، منیش لە وەڵامدا دەڵێم ئەی چی بکەین و چۆن بژین ئەگەر ئەم کارە نەکەین؟». ئاماژەی دا هەندێکجاریش بەم پەندە کوردیە وەڵامیان دەداتەوە «دەستی ماندو لەسەر سکی تێرە».

ئیشەکەی (سەمەد و روناک)، نەک هەر لەکفری، بەڵکو لە گەرمیان بەگشتی، هاوشێوەی کەمە، چونکە ئەگەرچی زۆر ژن و زۆر پیاو هەن کاردەکەن، بەڵام کەمیانە بەیەکەوەن لە ئیشەکەیاندا، بەتایبەتی بۆ کردنەوەی نانەواخانەیەک.

عومەر محەمەد، سەرۆکی لقی گەرمیانی سەندیکاکانی کرێکاران و پیشەوەرانی کوردستان، بۆ (نەوژین) جەختی لەوە کردەوە کە حاڵەتی کارکردنی هاوسەران بەیەکەوە لەگەرمیان زۆر کەمە، بەڵکو زۆرتر بە تەنهاو جیاواز کاردەکەن.

وتیشی: «زۆر هەڵمانداوە کە کار ئاسانی بکەین بۆ ژنان و کچان کە وەکو وڵاتانی دونیا ژنان شانبەشانی پیاوان کاربکەن، بەڵام لەسنوری گەرمیان لایەنە کۆمەڵایەتییەکە رێگرە».

بەڵام ئەو دو هاوسەرە، بەپێچەوانەی نەریتی باوەوە، ٩ ساڵ زیاترە پێکەوەو لە نانەواخانەکەیاندا کاردەکەن، چاویشیان لەوەیە کەبتوانن پەرەی زیاتر بە ئیشەکەیان بدەن و بیکەن بە کارگەیەک.

لەوبارەوە (روناک) وتی: «بیرمان لەکردنەوەی کارگەیەک کردوەتەوە، کە هاوکات فڕنیش بێت بۆ کاری هەویر بەگشتی، بەڵام کێشەی شوێن و هەروەها کێشەی داراییشمان هەیە، بۆیە ئەگەر رێکخراو یان لایەنێک هەبێت بتوانێت هاوکارییمان بکات، ئەوا ئێمە دەتوانین کارەکانمان فراوانتر بکەین».

جەختی لەوەشکردوە «مەرج نیە ئافرەت هەر کاری ماڵەوە بکات، بەڵکو دەبێت ئافرەتان سەربەزانە کاربکەن و دەست رەنگین بن، تابتوانن ماڵ و منداڵیان بژێنن بەسەربەرزی».

---

# لەئیشکردن دا ژنانی گەرمیان خەریکە جێ بە پیاوان لێژ دەکەن!

**▪ نەوژین، سازان مستەفا**

**ئەگەر چی زۆرینەی ئەو کاسبکار و فرۆشیار و دوکاندار و پیشەوەرانەی کە لەبازاڕەکانی کوردستان و گەرمیان بەتایبەتی دا هەن لە رەگەزی نێرن، بەڵام لەماوەی ئەم ساڵانەی دوایی دا ژمارەی ئافرەتانی ئیشکەر لەکەرتی تایبەت دا بەتایبەت لەگەرمیان دا روی لەزیاد بون کردوە.**

> **حساب بۆ قسەو توانج بکەین، ئەوا ناتوانین خەون و ئاواتەکانمان بەدی بێنین**

لەدوایین هەوڵی بەشداریی ژنان لە کەرتی تایبەت دا، مارکێتێک بەناوی (سۆران) کە ماوەی چەند مانگێکە لە کەلار دا کراوەتەوەو یەکێکە لە بازاڕە قەرەباڵەغەکانی شار، زۆرینەی کارمەندەکانی ئافرەتن، بەرپرسانیشی ئاماژە بەوەدەکەن ئەم کارە بازاڕەکەی بەهێزتر کردوە.

لەپاڵ ئەوەی زۆربەی کارمەندەکانی بازاڕەکە کچن، هاوکات زۆرینەشیان خاوەن بڕوانامەن، ئەوان بێهیوابون لە کەرتی گشتی و حکومیی، بێهیوای نەکردون لە کارکردن، بەڵکو ئەمجارەیان لە کەرتی تایبەت دەستیان بەکار کردوە.

جیلان مەجید، یەکێک لە کارمەندەکانی بازاڕەکە، بۆ (نەوژین) وتی: «بەهۆی قەیرانەوە دامەزراندن لە کەرتی گشتی نەماوە، بۆیە روم لەم بازارە کردوە نزیکەی ٢ مانگە لێرە کاردەکەم و کارەکەم زۆر پێخوشە«.

سەرپەرشتیاری (بازاڕی سۆران) یش، شیروان ئەحمەد، لەوبارەوە بۆ (نەوژین) وتی: «ئەوەی ئەم بازاڕەی جیاکردوەتەوە لە بازارەکانی ئەم شاردا ئەوەیە کە فرسەتێکی باشتری داوە بە ئافرەتانی ناوچەکە بەتایبەتی ئەو کچانەی کە خاوەن بڕوانامەن، بەڵام لەکەرتی گشتی دانامەزراون، بۆئەوەی لێرەدا دەست بەکار بکەن».

هەندێک لەو کچانەش تائێستا خوێندکارن و لەپاڵ خوێندنەکەیان، لەم بازاڕەدا کاردەکەن.

تاڤگە عومەر، یەکێکە لەو کارمەندانە کە خوێندکاری قۆناغی چواری زانکۆیە. ئەو بۆ (نەوژین) وتی: «من ماوەی مانگێکە لێرە کاردەکەم و زۆرم پێخۆشە کە لە بازاڕێکی وا ئیشدەکەم، سەرەڕای ئەوەی خوێندکاری زانکۆم و رۆژانە بەخوێندنەوە سەرقاڵم، بەڵام پێمخوشە داهاتێکی خۆمم هەبێت وپشت بەخۆم ببەستم و هاوکات وئەزمونێکیش لەکارکردن بەدەستبێنم».

ئەم بازاڕە جگە لەوەی هەلی کاری بۆ دەرچوانی زانکۆ وپەیمانگاکان رەخساندوە، بەهەمان شێوە هەلی کاری بە ژنانی ماڵەوەش داوە.

دیمەن عەلی، یەکێکە لەو ئافرەتانە، بۆ (نەوژین) وتی: «راستە هەمو کارێک ماندوبونی خۆی هەیە و منیش ماندو دەبم، سەرەڕای ئەوەش زۆر خۆشحاڵ و سەربەرزم بەکارەکەم، هیوادارم هەمو ئافرەتێک هەوڵ بدات کارێکی وا بدۆزێتەوە تاوەکو بژێوی ژیانی خۆیان پێدابین بکەن و تورزێکیش هەناسە بدەن و هەر لەماڵەوە و لەنێوان ئەو چوار دیوارە دا نەبن».

بەو پێیەی کۆمەڵگەی کوردی، بەکومەڵگەیەکی پیاو سالاریی ناسراوە، بۆیە کارکردنی کچان لە بازاڕ دا بە پیشەیەکی پیاوانە هەژمار دەکرێت و زۆر بەکەمی ژنان خۆیان لە قەرەی دەدەن، بەڵام ئەوەی مایەی تێبینی و خۆشحاڵیە ئەم شارە خەریکە هەنگاوێک دەنێت بەوەی ژنانیش بێنە کەرتی تایبەتەوەو ئیشی تێدا بکەن.

شیروان ئەحمەد، سەرپەرشتاری بازاڕەکە، ئاماژەی بەوەکرد کە لەمیانەی کارکردنیان دا تێبینیی ئەوەیان کردوە هیچ جیاوازیەک نییە لەکارکردنی کچان و کوڕان. وتیشی: «تەنانەت کاشێرەکانمان کە هەستیارترین جێگایە لەبازارەکەدا، بە دەستی کچەکانەوەیە، تائێستاش ماوەی چەند مانگێکە ئەم بازاڕە کراوەتەوە، ئەو کچانەی لێرەن نەک هەر لەسەر ئاستی ئیدارە وەکو دەستە خوشکیک کاردەکەن، بەڵکو بۆ پێشخستنی بازاڕەکەش بەجدیەوە هەوڵ دەدەن».

بەڵام یەکێک لەو ئاستەنگانەی کە ژنان لەکاتی ئیشکردن دا روبەروی دەبنەوە، ئەو تێڕوانینەیە کە کۆمەڵگا بەرامبەریان پیشانی دەدات، یان ئەو توانج و قسانەیە کە روبەروی دەبنەوە.

لەوبارەوە (تاڤگە) وتی: «نابێت حسابێک بۆ ئەو قسەو توانجانە بکەین، چونکە ئەگەر وابێت ئەوا ناتوانین خەون و ئاواتەکانمان بەدی بێنین».

(جیلان)یش وتی: «بەو کچانە ئەڵێم کە لەترسی قسە و توانجی خەڵک ناتوانن کار بکەن، نابێت شەرم بکەن، چونکە ئەوانیش وەکو پیاوان ئازادن و ئەگەر کارێکی گونجاو هەبێت بۆیان، ئەوا با ئەنجامی بدەن و گوێ بە قسەی خەڵک نەدەن».

(شیروان ئەحمەد)یش جەخت لەوەدەکاتەوە کەیەکێک لە ترسە هەمیشەییەکانی کچان لەکارکردن، ترسە لەتوانج و قسەو قسەڵۆک «من زۆربەی کات بە کچەکانم وتوە خۆتان خۆتان بن و گوێ بە قسەی کەس مەدەن، خوشبەختانە تاوەکو ئێستاش توشی هیچ جۆرە کیشەیەک نەبونەتەوە، بەڵکو زۆرێکیش لەپیاوان دەستخۆشیان لێکردون».



**کچێک لەکاتی کارکردندا لە مارکێتێکی کەلار**

# باڵوێزەکەی خانەقین

■ نەوژین، ئومێد زەنگەنە

**کچە کوردێکی دانیشتوی قەزای خانەقین کەهاوکات چالاکوانێکی مەدەنیشە، لەلایەن رێکخراوی دیداری باڵوێزانی ئاشتی بۆ کاری چاکە و گەشەپێدان، بەباڵوێزی ئاشتی دیاری دەکرێت.**

زەینەب ئەرکەوازی، ئەو کچە کوردەی شاری خانەقینە کە وەک باڵوێزی ئاشتی پارێزگای دیالە لەلایەن رێکخراوی دیداری باڵوێزانی ئاشتی بۆ کاری چاکەو گەشەپێدان کە نوسینگەی رێکخراوەکە لەشاری بەغدای پایتەختی عێراقە، دیاری دەکرێت.

لەلێدوانێکی تایبەتیشدا بۆ (نەوژین)، (زەینەب ئەرکەوازی) دەڵێت: «بەبڕیارێکی فەرمی رێکخراوی دیداری باڵوێزانی ئاشتی بوکاری چاکەوگەشەپێدان وەک باڵوێزی ئاشتی پارێزگای دیالەدەستنیشانکراوم».

زەینەب وەک خۆی دەڵێت شانازی بەوەدەکات کەوەک ئافرەتێکی کوردی خانەقین لەلایەن رێکخراوێکی عێراقیەوە بەباڵوێزی ئاشتی هەڵبژێردراوە.

لەدرێژەی لێدوانەکەیدا زەینەب ئەرکەوازی، لەبارەی ئەزمونی خۆیەوە دەڵێت: «چەندین ساڵە وەک چالاکوانێکی کۆمەڵگای مەدەنی و بەتایبەت مافەکانی مرۆڤ کاردەکەم و هاوکات ساڵی رابردوش وەک راوێژکاری رۆشنبیری پارێزگای دیالە دەستیشان کرام و لەئێستاشدا چەندین گروپی خۆبەخشم هەیە».

ئاماژەی دا ئەمانجی ئەو رێکخراوەش لەدەستنیشانکردنی باڵوێزەکانی ئەوەیە کە ئەو کەسە بتوانێت کەسی سەرکردە بنیات بنێت وهۆشیاری چالاکی خۆبەخشی و هاوبەشی بڵاوبکاتەوە.

وتیشی: «پێدانی نازناوی باڵوێزیش بەئاسانی بەهەمو کەسێک نادرێت، چونکە ئەو کەسەی کە نازناوەکە وەردەگرێت دەبێت چەند ساڵێک پێشتر لەبواری کۆمەڵگای مەدەنیدا خزمەتی کردبێت و هەڵسەنگاندن بۆکارەکانی دەکرێت».

لەبارەی ئەو گروپ و رێکخراوانەشی کەلەئێستادا وەک خۆی دەڵێت سەرپەرشتیان دەکات، زەینەب دەڵێت: «بەخۆشحاڵیەوە لەئێستادا لەشاری خانەقین سەرپەرشتی چەندین گروپ دەکەم لەنمونەی ئەو گروپانەش فۆتۆگرافی و خانمانی شێوەکار و گروپی ئاشتیە کە لەم گروپەدا نزیکەی ٢٥ کچ وکوڕ تێیدا بەشدارن، هەڵبەتە لەم قەیرانی دارایی و سیاسیەشدا کە گەنج بڕوای بەکاری خۆبەخشی هەبێت، هێندە ئاسان نییە».

لەبارەی ئامانجی داهاتویەوە، ئەرکەوازی دەڵێت: «هیوادارم بتوانم لەداهاتودا زیاترخزمەت بە گۆمەڵگا و میلەتەکەم بکەم».

سەبارەت بەو رێکخراوەشی کەزەینەبی وەک باڵوێزی ئاشتی دەستنیشان کردوە، دەڵێت: «رێکخراوێکی ناحکومیە و بارەگای سەرەکی لەویلایەتەیەکگرتوەکانی ئەمریکایە و نوسینگەشی لەشاری بەغدایە و لەلایەن ٧٥ وڵاتی جیهانەوە بەفەرمی متمانەی پێکراوە».

لەشاری خانەقین سەرپەرشتی چەندین گروپی خۆبەخشی دەکەم

زەینەب، باس لە هۆکاری دەستنیشانکردنی خۆی دەکات لەلایەن رێکخراوەکەوەو دەڵێت: «ماوەیەکی زۆرە لەلایەن خەڵکانی دەرەوە چاودێری کار و چالاکیەکانم دەکرێت دوای هەڵسەنگاندنی کارەکانیشم لەلایەن رێکخراوەکەوە وەک باڵوێزی ئاشتی بۆ ساڵی ٢٠١٧ دەستنیشانکرام کە لەچوارچێوەی کارەکانمدا لەساڵانی رابردودا بەبێ جیاوازی رەگەز و نەتەوە و تەمەن خزمەتم کردوە».

لەکۆتایی وتەکانیدا (زەینەب ئەرکەوازی) دەڵێت: «بەهۆی ئەو کاروچالاکیانەشی کەمن لەشاری بەغدا ئەنجامم داوە لەلایەن پەرلەمانتارێکی عێراقیەوە لە کڵێسای سابیئەی مەندائیەکان خەڵاتکرام و ئەمەش هاندەرێکە بۆئەوەی زیاتر خزمەت بکەم وەک ئافرەتێکی کورد و خەڵکانی دیکەش هاوشان لەگەڵ ئێمەدا خزمەت بکەن».



# ژنێکی گەرمیانی مزگەوتێک لەسەر داهاتی خۆی دروست دەکات

■ نەوژین، پەیام جەمال

**ئەگەرچی زۆرێک پێیانوابوە کە ژنێکی وەکو ئەو ناتوانێت بژێویی خۆیشی پەیدا بکات، کەچی ئەو نەک توانی بە سەربەرزانە ژیان بکات، بەڵکو ئەو ئاواتەشی بەدیی هێنا کە دروستکردنی مزگەوتێک بو بۆ گوندەکەیان.**

ئاسکە عەبدوڵڵا، ئەو ژنە گەرمیانیەی کەلەسەر ئەرک و تێچونی خۆی، توانی مزگەوتێک لەگوندی (سەنگەری سەرو) سەر بە ناحیەی قۆرەتوی ناوچەی گەرمیان دروست بکات.

ئەو توانیویەتی لەرێگەی کارکردن و کاسبییەوە، سەرباری بژێویی ژیانی، پارەیەکی زیادەشی دەست بکەوێت و لەگەڵ هەڵکشانی تەمەن، ئەم پارەیەی بۆ دروستکردنی ئەو مزگەوتە خەرج کردوە، کە ئاواتێکی لەمێژینەی بوە.

لە بارەی کارەکانی دروست کردنی مزگەوتەکەوە، دەڵێت: «هەر لە زوەوە ئاواتم ئەوە بوە بتوانم مزگەوتێک دروست بکەم کە ببێتە خێرێکی دونیایی بۆ خۆم و کەسوکاریشم».

باسیلەوەشکرد کە ئەم کارەی دوای چەندین مانگ کارکردن، خۆشبەختانە بەدییهاتوە. وتیشی: «زۆربەی تێچونەکەی لەسەر خۆم بوە، بەشێکیش لە پێداویستیەکانی مزگەوتەکە لە لایەن خێرخوازانەوە و دابین کراوە و دو ئەندازیاریش بە خۆبەخشی سەرپەرشتی کارەکانیان کردوە.»

هەرچەندە خۆی بە تەنها لە خێزانەکەی ماوەتەوە، بەڵام ئاسکەخان ئاستەنگەکانی ژیان کۆڵیان پێنەداوە و وەکو ئافرەتێکی بوێر بەسەر ئاستەنگەکاندا زاڵ بوەو توانی خەونەکەشی بەدی بێنێت.

دەڵێت: «هەندێک کەس لەسەرەتاوە پێیان دەوتم ناتوانی خۆت بژێنی، بەڵام من کۆڵم نەداو بەردەوام بون، سوپاس بۆ خوا بە سەربەرزی ژیام و توانیم ئاواتەکەشم بە دی بێنم.»

ئاسکە، نمونەی یەکێکە لەو ئافرەت سەرکەوتوانەی وێڕای دەست خستنی بژێوی ژیانی، توانی ئاواتەکەی خۆشی بە دیبێنێت. ئەو هەرچەندە لە تەمەنی لاوێتیدا نیە، بەڵام هێز و توانای هیچی لە لاو کەمتر نیە، لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی بڕوابەخۆبون و گەشبینییەکی زۆرە، کە ئەمەش وایکردوە لە کارەکەی دا سەرکەوتوی بکات.

دەڵێت: «وەکو کرێکارێک سەرپەرشتی کارەکەم دەکرد و سوپاس بۆ خوا توانیم بەسەرکەوتویی تەواوی بکەم.»

ئەو مزگەوتەی ئاسکەخان دروستی کردوە (مزگەوتی سەنگەری سەرو)، لەسەر روبەری (٢٨٠) مەتر دروست کراوە و ماوەی دو ساڵ کاری تێداکراوە تاوەکو کارەکانی بە کۆتا گەیشتوە و تێچوی مزگەوتەکەش نزیکەی حەفتا هەزار دۆلار بوە.

ئاسکەخان، رۆژانە بە بەخێوکردن و کڕین و فرۆشتنی مەڕ و ماڵاتەوە سەرقاڵەو لەم رێگەیەوە بژێوی ژیانی پەیدا دەکات، هەر لەو رێگەیەشەوە پارەی بۆ دروستکردنی مزگەوتەکە کۆکردوەتەوە.

ئەو دەڵێت: «زۆر جار کە دەڕۆمە مەیدانی ئاژەڵفرۆشان، خەڵکی پێیان سەیرە و قسە دەکەن، بەڵام من بڕوام بەخۆمە و گوێ بە قسەوقسەڵۆکی خەڵکی نادەم.»

بەڵام لەبری قسەو قسەڵۆک و رەخنەو توانج، ئاسکە خان کە مزگەوتەکەی دروستکردوە، روبەروی دەستخۆشییەکی زۆر بوەتەوە.

ئەو بەخۆشحاڵییەوە سەبارەت بە دروستکردنی مزگەوتەکە و بە دەمەوە هاتنی خەڵکی بۆ پرۆژەکەی دەدوێت و دەڵێت: «خەڵکێکی زۆر لە کاتی کردنەوەی مزگەوتەکە ئامادەبون و دەستخۆشیەکی زۆریان لێکردم، ئەمەش منی هێندەی دیکە خۆشحاڵ کرد».





# خانەقین، ناوەندی هونەریی زۆر و کچانی هونەرمەندی کەم

▪ نەوژین، سۆما جاف

**سەرەڕای بونی پەیمانگایەکی هونەرە جوانەکان لە شاری خانەقین و بونی چەند ناوەندێکی پێگەیاندن و ڕاهێنانی هونەری وچەندین هونەرمەندی کچی بە توانا، بەڵام بەشداریکردنی کچان لە کاری هونەری بە تایبەت هونەری شێوەکاری وەک پێویست نیە.**

هـۆکارەکان چیـن؟ ئایـا گرنگییدان بە هونەری کچان کەمـە و دەرفەتیان پێنادرێـت؟ کۆمەڵـگا قبوڵـی بونی هونەرمەندی کچ ناکات یان کچان خۆیان سستن؟ پەیمانگاکان تەنها روکەشن یان دەتوانن هونەرمەند دروست بکەن؟
لـەم راپۆرتـەدا کچانـی هونەرمەندی خانەقین و مامۆسـتایانی هونەر، وەڵام دەدەنەوە.
سـولاف محەمەد، کچە شێوە کارێکی دانیشتوی شـاری خانەقینە و لەبارەی کەمـی بەشـداریکردنی کچـان لـە بـواری هونـەر، بە (نەوژیـن)ی وت: «بەشـداریکردنی کچانـی شـێوەکار لە بـواری هونەردا لەشـاری خانەقین لەئاستیکی باشدا نیە، هەڵبەت رێگری بونی هەیە، یان بەشێوەیەکی تر ئێستا وڵات لە دۆخێکـی قەیراناویدایە و ئەو دۆخەش هەمـو بوارەکانی گرتوەتەوەو وایکردوە مرۆڤەکان ئەوەندەی خەریکی مەشغوڵیەتی ژیان بن کەمتر رو لەو بوارە بکەن کە تێدا پسپۆرییان هەیە».
بەڵام (تـاژان فەخرەدین)، کە کچێکی شێوەکاری شاری خانەقینە و بەشداری لەچەندین کاری شـێوەکاری هاوبەش و تاک دا کردوە، هۆکارەکان دابەش دەکات بەسـەر چەند بەشـێک دا، لەوانەش: کلتوری، کۆمەڵایەتی و خوێندن.

ئێمە ئەگەر بمانەوێت کارێک بکەین، هیچمان لە پیاوان کەمتر نیە

ئـەو بۆ (نەوژین) وتـی: «هەندێکجار کچان حـەز دەکەن کار بکـەن، بەڵام خێزانەکانیان رێگایان پێنادەن».
تاژان، ئاماژەی بەوەشدا، هۆکاری رێگا پێنەدانـی کچان دەگەڕێتـەوە بۆ ئەو کلتور و دابونەریتەی کە پێشوتر خەڵکی ترساندوە، هەروەها «عەیبە»ش رۆڵی هەبوە لەوەی کە کچ زۆر بوێریی نەکات بۆ پەرەدان بـە بەهرەکانی هاتوچۆی دەرەوەی ماڵ بکات.
بـەڵام (سـۆلاف)، هۆکارێکـی تری کاریگەری بەشـداریی نەکردنی کچانی خانەقین لە کایەی هونەریی، بۆ لایەنی کۆمەڵایەتـی و دارایـی دەگێڕێتـەوە.
«هۆکارێکی تری کەمی بەشداریکردنی کچـان دەگەڕێتەوە بۆ ئـەوەی ئەگەر کچێک بیەوێت کار بکات قورسە ئەگەر ماڵەوەیان هـاوکاری نەکـەن، لەروی ئابورییەوە یـان لە روی هاتوچۆکردنی بۆ درەوەی ماڵ».
ئـەوەی زیاتـر بابەتەکـەی زەق کردوەتـەوە، ئەوەیـە کـە ئەگەرچی لەخانەقین دا پەیمانگایەکی تایبەت بە هونەرەجوانەکان بونی هەیە، بەڵام ئەمە واینەکردوە کە بەشداریی کچان لەکایەی هونەردا بەشـی پێویست بەرەوپێشەوە بېات.
تـاژان، هۆکاری ئەمـە دەگێڕێتەوە بۆ سسـتی خودی کچان «بەداخەوە ئەو کچانەی کە لەبواری هونەردا دەخوێنن دوای تەواوکردنـی خوێندنەکەیان حەز ناکەن کار بکەن، چونکە خوێندنەکەیان لە بنەڕەتەوە تەنها بۆ بەدەسـتهێنانی بروانامە بوە».
(سۆلاف)یش رایوایە کە کچان زۆرجار هونـەر وەکو بابەتێکـی گرنگ هەژمار ناکـەن و بەشـتێکی لاوەکـی دەزانن «بەداخـەوە کچـان خۆیانیـش کەم تەرخـەم بون لە بەرەوپێشـەوەچونی هونەرەکەیان، بەشـێک لەو خوێندکارە کچانـەی دوای ئـەوەی خوێندن تەواو دەکـەن، ئەوەندەی بیر لە ئیشـی تر دەکەنەوە بیر لە پسـپۆریەکەی خۆیان ناکەنەوە».
مامۆسـتایەکی پەیمانـگای هونـەرە جوانەکانی خانەقینیش، هاوڕایە لەگەڵ ئەو دو کچە شێوەکارە.
ماجد شـالیار، بـۆ (نەوژیـن) وتی: «ئـەو خوێندکارانـەی لەو بەشـانە وەردەگیرێن، خۆیان حەزیان پێی نیە، تەنها ئامانجیان تەواوکردنی خوێندن و وەرگرتنی بڕوانامەیە».
شالیار، ئەوەشی وت: «کێشەی کەمی بەشداریی کچان لەکایەی هونەردا تەنها لە خانەقین نیە، بەڵکو لە هەمو لایەک بونی هەیە، بەڵام ئەوەی زیاتر تیشکی خستوەتە سەر شـارەکەی ئێمە، بونی ناوەندێکی هونەریی وەک پەیمانگایە».
ئـەو مامۆسـتایەی پەیمانـگای هونەرەجوانەکانـی خانەقـی، ئاماژەی بەوەکـرد کەئـەوان وەک پسـپۆڕان و هونەرمەنـدان بـەردەوام هەوڵـی پێگەیاندنـی کچانـی هونەرمەندیـان داوە، بەڵام پێشـیوایە کە دەبێت کچان خۆشـیان خەمی ئـەم بابەتە بخۆن و کاراتر بێنە مەیدانەکەو دەسـت بدەنە کاری هونەریی.
(سـۆلاف محەمەد)یش، هاوڕایە لەگەڵ مامۆسـتاکەی لـەوەی دەبێـت کچان خۆشـیان هەوڵبدەن و بێنـە مەیدانی کاری هونەرییەوە.
دەڵێت: «هیوادارم کچان زیاتر بایەخ بە بەهرەکەی خۆیـان بدەن، چونکە ئێمە ئەگەر بمانەوێت کارێک بکەین، هیچمان لە پیاوان کەمتر نیە».

کچان دوای تەواوکردنی خوێندن لەبواری هونەر حەز ناکەن کار بکەن



# ئەو ژنە نوسەرانەی بە ناوی پیاوەوە نوسیویانە







▪ نەوژین

**لەمێژوی ئەدەبی جیهانی دا، هەندێک لە نوسەرانی ژن هەن کە بەهۆی بارودۆخی کۆمەڵایەتییەوە، لەبری ناوی راستەقینەی خۆیان، ناوی پیاوانیان بەکارهێناوە. بەشێک لەوانە کارەکانیان بەو مەبەستە کردوە، کە ئەگەر خوێنەران بیانزانیبایە نوسەرانی دەقەکان ژنن، ئەوا گرنگیەکی ئەوتۆیان پێنەدەدا. بەشێکی تریشیان بەوهۆیە ئەوکارەیان کردوە، بۆ ئەوەی خۆیان بسەلمێنن.**

بەرای ژنە نوسـەری ئینگلیزی ناسراو (ڤێرجینـا وۆڵـف)، ئەم مەسـەلەیە لەوەوە سـەری هەڵـداوە لەکۆمەڵگە پیاوسالاریەکان دا، هیچ دەستکەوتێکی ژنان بەهەند وەرنەگیراوە، بۆیە ژنانیش ناچـار بون خۆیـان لەپشـت ناوێکی پیاوانەوە بشـارنەوەو پەرە و گەشە بە تواناکانیان بدەن.
لێرەدا لیسـتێک بەناوی دیارترین ئەو نوسـەرە ژنانە دەخەینە رو، کە ناوی پیاوانیان لەخۆیان ناوە.

## لویزا مای ئەلکۆت

لویزا ئەلکۆت، بەیەکێک لەبەناوبانگترین نوسەرانی سەدەی ١٩ هەژمار دەکرێت. سـەرەتای کاری ئەدەبـی، بەنـاوی (ئەی. ئێم. بارنـەرد)ەوە بابەتەکانی بڵاودەکـردەوە، بۆ ئـەوەی خۆی دور بگرێـت لە پەرچەکـرداری کۆمەڵگەی ئەمریکـی لەو سـەردەمەدا کـە زۆر موحافیزکارانە بو بەرامبەر بە بەشداریی ئەدەبیی ژنان.
ئەلکـۆت لەنوسـینەکانی دا، ئـازار و کۆژانەکانـی ژنـان و منالانی پیشـان دەدا، پاش ماوەیـەک لەبەرکارهێنانی ناوی (بارنەرد)، بەرهەمەکانی دواتری بەناوی خۆیەوە بڵاو کردەوە.

## ماری ئان ئیڤانس

رۆماننوسـی ئینگلیزیـی (مـاری ئان ئیڤانس)، بەیەکێک لـە بەناوبانگترین نوسەرانی «چاخی ڤیکتۆری» هەژمار دەکرێـت. ئەو بەناوی (جۆرج ئیلیۆت) ەوە هاتە ناو کایەی ئەدەبەوە، بۆ ئەوەی نوسینەکانی بەهەند وەربگیرێت.
پـاش بڵاوکردنەوەی رۆمانـی (ئادەم بید) لەساڵی ١٨٥٩، ناوبانگێکی زۆری پەیداکـرد و دەستخۆشـیەکی زۆری بۆ هـات، هەربۆیە ئەویش ناسـنامەی راسـتەقینەی خۆی ئاشکرا کرد، بەڵام دوای ئـەوەش لە بڵاوکردنـەوەی کارە ئەدەبیەکانـی دا، هەرنـاوی (جـۆرج ئیلیۆت)ی بەکاردەهێنا.

## چارلۆت برۆنتی

رۆماننـوس و شـاعیری ئینگلیزیـی (چارلـۆت برۆنتـی)، نوسـەری رۆمانـی (جین ئاییـەر) کەیەکێکە لە بەناوبانگتریـن رۆمانەکانی مێژو، لەژێر ناوی (کیۆر بیـڵ) خۆی مەڵاس دابو، ئەویش بەوهۆیەی کە پێیوابو لەرێگەی ئەم ناوەوە دەتوانێت کارەکانی باشـتر پێش بخات.
رۆمانەکـەی برۆنتی، پاشـتر بەناوی ئەسڵی خۆیەوە بڵاوکرایەوەو تائێستاشدا وەکـو رۆمانێکی گرنـگ و بەناوبانگ دەخوێنرێنەوە.

## ئیمیلی برۆنتی

نوسەری رۆمانی بەناوبانگ (بەرزایەکانی ویزەرنیگ)، بەناوی راستەقینەی خۆیەوە رۆمانەکەی بڵاو نەکردەوە، بەڵکو ناوێکی پیاوانەی بۆ دیاریی کردبو، کە (ئەلیس بەیڵ) بو. وەکخـۆی ئاماژەی بۆکردوە بۆیە ناوێکـی پیاوانەی هەڵبژاردوە، بۆ ئـەوەی بەهـۆی رەگەزەکەیەوە کەس لایەنگیریی بۆ رۆمانەکەی نەکات.
پـاش کۆچـی دوایی، خوشـکەکەی جارێکی دیکە بە رۆمانەکەی دا چوەوەو بەناوی راسـتەقینەی (ئیمیلی برۆنتی) بڵاوی کردەوە، لەئێستاشدا بەیەکێک لە دیارترین رۆمانەکانی ئەدەبی کلاسیکی ئینگلیزیی هەژمار دەکرێت.

## ئەمانتین ئورۆر لوسێل دوپین

ئەم ژنە نوسەرە فەرەنسیە، لەژێر ناوی (جـۆرج سـاند)، بەرهەمەکانی خۆی بڵاودەکردەوە. ئەو کە کچی خێزانێکی ئەریسـتۆکراتی خانەدانی فەرەنسـیی بو، لەپاڵ نوسـینی ئەدەبـی، وتار و شیکاری سیاسی و رەخنەیی دەنوسی و هەروەک چالاکوانێکی دیاری بزوتنەوەی ژنانیش بو. ئەگەرچی بەناوی پیاوانەوە دەینوسی، بەڵام لەلایەن بەشێکی زۆری خوێنەرانەوە ناسراو و ئاشکرا بو.

## نیلی هارپەر لی

ژنە نوسەری ئەمریکی، لە بڵاوکردنەوەی تاکـە رۆمانەکەی دا، تەنها نازناوەکەی دانابو و ناوی یەکەمی خۆی نەنوسیبو، بۆ ئەوەی بەگرنگیەوە وەربگیرێت.
رۆمانەکەی‌نیلیی، (کەبالندەیەکی‌کێویی دەکوژیت)، تایبەتە بەتیشکخستنەسەر پرسـی رەگەزپەرسـتی، کەدواتـر بەیەکێک لە باشترین و سەرکەوتو ترین رۆمانەکانـی ئەمریکا دەستنیشـانکراو بەمهۆیەشـەوە خەڵاتی «پۆلیتەرز»ی پێبەخشرا.

سەرچاوە:
http://inkitab.me

# هێشتا لەگەرمیان کچان بەزۆر بەشو دەدرێن



**▪ نەوژین،**
**زریان محەمەد – جوانە جەلیل**

**ئەگەرچی ژمارەی حاڵەتەکانی بە زۆر بەشودانی کچان لەگەرمیان وەکو پێشوتر بەو زەقی و زۆرییە نەماوەتەوە، بەڵام هێشتا دیاردەکە بنبڕ نەکراوەو ماوە، هێشتا خێزانگەلێک هەن کە یەکێک لە سەرەتاییترین و گرنگترین مافەکانی مرۆڤ کەدیارییکردنی هاوبەشی ژیانە، بە کچان ڕەوا نابینن و بەخواستی خۆیان بەشویان دەدەن.**

بەگوێرەی ئەو بەدواداچونەی (نەوژین) کردویەتی، هۆکاری ئەم حاڵەتە جیاواز و جۆراوجۆرە، هەندێکی پەیوەندی بە مەسەلەی خزمایەتیی و بەشودانی کچانەوە هەیە بە کەسانی خزمی خۆیان، هەندێکی دیکەشیان هۆکاری ئابوریی و دارایی هەیە، بەڵام سەرەکیترین هۆکار ئەوەیە کەهێشتا عەقڵیەت و تێڕوانینی بەشێک لەخێزانەکان لەو ئاست و رادەیە دایە، کە لێناگەڕێن کچەکانیان بە دڵی خۆیان هاوبەشی ژیان هەڵبژێرن.

میدیا محەمەد، (٢٠) ساڵ، کە کەمتر لە ساڵێک ژیانی هاوسەری پێکهێناوە، یەکێکە لە نمونەی ئەو کچانەی کە بە زۆر بە شودراوە. ئەو بۆ (نەوژین) دواو وتی: «بە هۆی فشاری خێزانەکەم و بە تایبەت هەڕەشەکانی مامەوە ناچار بوم بڕیاری هاوسەرگیری بدەم لەگەڵ کوری مامم کە بەهیچ شێوەیەک خۆشم نەدەویست».

وتیشی: «بەهۆی نەبونی خۆشەویستیم بۆی، بۆماوەی (٩) مانگ لەگەڵی بوم، دواتر گەڕامەوە ماڵی باوکم و بڕیاری جیابونەوەم دا، لە ئێستاشدا بۆ ماوەی (٤) مانگە لە هاوسەرەکەم جیابومەتەوە».

ئامارەکان ئەوەدەخەنە رو کە حاڵەتەکانی بەزۆر بەشودانی کچان لە ساڵی رابردودا، زیاتر لە روداو و حاڵەتەکانی دیکە زیادیکردوە.

بەپێی ئامارەکانی بەڕێوەبەرایەتی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی خێزانی لە گەرمیان، بۆ ساڵی (٢٠١٦) شەش حاڵەتی بەزۆر بە شودان هەبوە، بەڵام لە ماوەی تەنها دو مانگی سەرەتای ئەمساڵەوە (١) حاڵەت تۆمار کراوە.

عەقید لەمیعە محەمەد، بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی خێزانی لە گەرمیان، ئاماژە بەوەدەکات کە رەنگە رێژەی حاڵەتەکان زۆر لەوە زیاتر بن کە تۆمارکراون.

ئەو بۆ (نەوژین) دەڵێت: «ئەو ئامارانەی لە بەردەست دان ئامارێکی دەقیق نین و رێژەکە لەوە زیاترە، چونکە ئەو کچانەی کە لە لایەن خێزانەکانیانەوە بەزۆر بە شو دەدرێن جورئەتی ئەوەیان نیە سکاڵا لەسەر خێزانەکانیان تۆمار بکەن، بۆیە بە ناچاری ئەو هاوسەرگیریە قبوڵ دەکەن».

لەمیعە محەمەد، ئەوەی خستەرو کە خراپی ئەم جۆرە لە هاوسەرگیریی ئەوەیە کە ئەگەری لەبەریەک هەڵوەشاندنەوەی زیاترە تاوەکو بەردەوام بونی «ئەگەر ئەو هاوسەرگیریەش بەردەوامی هەبێت، ئەوا لە دروست بونی بچوکترین کێشەو گرفت ئەگەری جیابونەوە دروست دەبێت».

جەختیشیکردەوە: «بەزۆر بە شودانی کچان جۆرێکە لە توندوتیژی کە بەرامبەر بە کچان ئەنجام دەدرێت».

بەڵام ئەگەر ئەم کارە توندوتیژییە، ئەوا یاسا چ رێوشوێنێک دژ بەو حاڵەتە دەگرێتە بەر و چۆن بەدواداچونی بۆ دەکات؟

پارێزەر (دانا ئەحمەد)، وەڵامی ئەم پرسیارەی (نەوژین) دەداتەوە.

وتی: «بەپێی یاسای ژمارە (٨)ی ساڵی (٢٠١١)ی توندوتیژی خێزانی، یاسا دو جۆر سزای بۆ ئەو کەسانە دیاری کردوە کە ئەو جۆرە پرۆسەیە ئەنجام دەدەن: یەکەمیان لە روی مادییەوە سزای (١) ملیۆن دینار بۆ (٥) ملیۆن دینار دەبێت، دوەمیان لە روی سزای بەند کردنەوە دەبێت لە (٦) مانگ کەمتر نەبێت و لە (٣) ساڵ زیاتر نەبێت.»

کاریگەریەکانی بەزۆر بە شودانی کچان سەرەڕای ئەوەی کە دەبێتە هۆی بەرز بونەوەی رێژەی تەڵاق و تێکچونی شیرازەی نێوان خێزانەکان، کاریگەری دەرونی خراپیش لەسەر ئەو کچانە بەجێدەهێڵێت کە بە زۆر بە شو دەدرێن و لە دوای جیابونەوەیان ناتوانن بە ئاسانی هاوسەرگیری ئەنجام بدەنەوە و دەبنە جێی تانەو تەشەری کۆمەڵگا و دەوروبەریان، ئەمەش بەرونی لە روخسار و وتەکانی (میدیا)وە دەبینرا.

ئەو کە بەزۆر بە کوڕە مامی خۆی بەشودرابو، باسیلەوەکرد پاش ئەوەی نەیتوانیوە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا درێژە بە ژیان بدات لێی جیابوەتەوە، بەڵام ئێستا لەبەردەم قسەوقسەڵۆکی کۆمەڵگادایە.

عەقید لەمیعە محەمەد، ئاماژەی بەوەکرد کە بەپێی ئەو حاڵەتانەی کەهاتوەتە بەردەستیان، ئەوەیان لارون و یەکلا بوەتەوە کە ئەمجۆرە لەهاوسەرگیریی و ناچارکردنی کچان بە شوکردن، جگە لە تێکچونی شیرازەی خێزان و گەورەتربونی کێشەی خێزانەکان و تێکچونی شیرازەیان، چاوەڕێی دەرەنجامی باش ناکرێت.

بەشێک لە کەسوکاری کچان بەتایبەتی پیاوان، لەبەشودانی کچەکانیان بەویستی خودی خۆیان نەک کچەکەیان، ئاین دەکەنە پاساو، بەوەی کە شەرع رێگەی داوە باوک چارەنوسی هاوسەرگیریی کچی خۆی دیاریی بکات، بەوپێیەی باوک و «ولی امر»یتی.

بەڵام زانایەکی ئاینی، ئەم بۆچونە بەتەواوی رەد دەدکاتەوە.

مەلا ئیدریس ژاڵەیی، وتەبێژی لقی گەرمیانی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان، بۆ (نەوژین) وتی: «بەزۆر بەشودانی کچان دژی ئەو ئایەتە پیرۆزەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت کە پێویستە رێز لە بەنی ئادەم واتە (مرۆڤ) بگیرێت بە تایبەت ئافرەتان».

وتەبێژی لقی گەرمیانی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان، بە هەمان شێوەی عەقید لەمیعە، بە زۆر بەشودانی کچان بە توندوتیژی و تاوان دەزانێت، داوا لە خێزانەکانیش دەکات کە ئەو جۆرە تاوانە رابگرن بەرامبەر بە کچەکانیان.




---

## «پاش دو ساڵ لەبەشودانم ئینجا کەوتمە سوڕی مانگانەوە»

# چیرۆکی ئەو ژنەی لە ١٠ ساڵی دا بە شو درا

**▪ نەوژین**
**ئامادەکردنی: لەیلا ئەحمەد- تیمی رێکخراوی وادی لە گەرمیان**

**ئەم چیرۆکەی دەیگێڕینەوە، چیرۆکی ژنێکی بەتەمەنی گەرمیانە، کە ژن بونی بناغەی هەمو ئەو ناخۆشی و ئازارانەیە کە توشی بوە. مرۆڤێک چونکە کچ بوە لە بری رێز بە چاوی کینەو سوکەوە سەیر کراوە، هەر ئەمەش وایکردوە لە تەمەنی ١٠ ساڵان داو پێش پێگەیشتن، بەشوبدرێت بەپیاوێکی بەتەمەن.**
**چیرۆکی دایە «حەلاو»، لەسەر زاری خۆیەوە دەبیستین.**



ئەو بەدەم گریانەوە، بۆی گێڕاینەوە کە ٧ «خۆشک» بونە، خزم و خەڵکی گوندەکەیان لۆمەی دایکیان کردوە کەهەر کەنیشک دەهێنێتە دونیاوە، بەلەدایکبونی هەشتەم کەنیشک کە حەلاو بوە، دەرگای دۆزەخ بۆ دایکی واڵابوە بەدەست تانەی دەوروبەرەوە، بۆیە ئەمی فرێداوەو ٧ رۆژ شیری پێنەداوە.

کێشەی نێوان دایک و باوکی زۆربوەو باوکی وتویەتی: «ئەگەر پێم بکرایە نەک شیری نەدەیتێ و فرێیدەیت، بەڵکو لەشوشەیەک هەڵم دەگرت تا هەتاهەتایە جوانی کەنیشکەکەمم هەڵبگرتایە، تادایکی رازیکردوە بەخێوی بکات».

خەم لەدوای خەم و هەژاری تەنگی بەخێزانی خاوەن ٨ کەنیشک و تەنها کوڕەکە هەڵچنیوە، بۆیە کەنیشکە گەورەکەیان داوە بەشو بەپیاوێکی پیری خاوەن کەنیشک و کوڕی تەمەن گەورە لەلادێیەکی تر کە لەلانەیەکی گڵی بچوک پڕ لەکێشەو خەم ژیانی بەڕێکردوە.

میمکە حەلاو، کەپیری تەنگی پێهەڵچنیوە، گێڕایەوە: «نازانم چۆن ئاهی سینەم هەڵڕێژم، نازانم لەکوێوە دەست پێبکەم و لەکوێوە کۆتایی پێ بێنم». وتی: «خەریکی پەچا ماڵین بوم بەپەلە خڕمیان بڕی تاگرتمیان و خەتەنەیان کردم، دو شەو و دو رۆژ لەتاو ئازار و خوێنبەربون لەسەر جێگا بوم، چەشتنی تاڵی خەتەنەم قەت بیرم ناچێت، لەتەمەنی مناڵی و سەرەتای پێگەیشتنم سزاو ئازاری زۆرم بینی لەبەر ئەوەی کەنیشک بوم».

دایە حەلاو، بە هەناسەیەکی ساردو بە گەروی پڕ لە گریانەوە باس لەدەستپێکردنی مەینەت و نەهامەتییەکانی لەتەمەنی ١٠ ساڵی تائێستای خۆی دەکات و ئێژێت: «لەبەر دەرگای ماڵمان لەگەڵ هاوڕێکانم یاریم دەکرد، ئەبینم کوێخای گوندەکەمان لەگەڵ مامە عەبدوڵڵای پیر، دورە پەرێز نیگامان دەکەن بەکوێخای وت ئەو کەنیشکە باڵابەرزو جوانە کەنیشکی کێیە؟ پێی وت خۆشکی باوەژنتانە گەر ئەتەوێت دەڕۆمە خوازبێنی بۆت، پیرە پیاو وتی نایدەن پێم مناڵە، کوێخا وتبوی دو کیلۆ چای بۆیان بێنە خوازبێنیەکەی لەسەر من. ئیتر ئەوەبو لە مێردەکەم مارە بڕام.

ئەو باسیلەوەکرد کە مارە بڕاوە ئەوەندە مناڵبوە کەفامی نەبوە لەبارەی هاوسەرگیریی و بە مێردەکەی وتوە «کاکە»! وتیشی: «کەدەچومە سەر کانی کەنیشکەکان دەیان وت لەپیاوە پیرەکە مارە کرایت پێیانم دەوت درۆ مەکەن ئەو کاکەمە من بۆ ئەو نابم کەچی مارەش بڕابوم! «

باسیلەوەشکرد «براکەم ناڕازی بو بەو کارەو شەڕی دونیای کرد لەسەرم ویستی شکاتی باوکم بکات نەمدەن بەو پیاوە پیرە، نەیانهێشت.»

وتیشی: «ژیانم لەنێو لەپی دەستی دایک و باوکم بو وێرانیان کرد، مردم و بەهەڵە ژیام، دوای دو ساڵ هاوسەرگیری ئینجا کەوتمە سوڕی مانگانە، ئەوەندە ترسام چومە لای خەسوم وتم شتێکم بەسەر هاتوەو هۆشیاریکردمەوە».

ئەم زوبەشودان و کامڵ نەبونە، کێشەی زۆری بۆ حەلاو دروست کردوە، بەوهۆیەوە ٤ مناڵی بوەو بەکۆرپەیی مردون!

دەشڵێت: «دوای مردوەکانم بومە خاوەنی ٤ کەنیشک و ٤ کوڕ».

میمکە حەلاو، کەتوڕەو سور هەڵگەڕابو لەداخی قوڵی لەمێژینەی خۆی هەر ئاخ و ئۆخی بو، وتی: «هەژاری و خەمی ماڵی باوکم هێشتا وەک خەمی رۆژگاری لای مێردەکەم کاری لێنەکردوم، کەسێک نەبو بەپشت و پەنام، لەنێو ژورێکی گڵی کۆن لەخانویەکی گەورەو چەندین خێزانی شوبراو ئامۆزاو خزمی تێدابو هەمویان کێشەیان منی ١٠ ساڵ بو کەنازانم خواردن ئامادەکەم و مناڵە لەدایکبوەکانم دەمرن و نازانم مێرداری بکەم، چەندین جار تۆرام بێسود بو دەمیان ناردەوە بۆ دۆزەخەکەی مێردم.»

باس لەو رۆژەش دەکات کەبوەتە خاڵێ جیاکەرەوە لەژیانی دا «رۆژێک زۆر گریام و توڕەبوم سوێندم خوارد چیتر رێگە نەدەم وەک مناڵێک گاڵتەم پێ بکەن و بەرەنگاری هەمو کێشەو گرفتێک ببمەوەو ژیانێکی سەر کەوتو بۆ مناڵەکانم فەراهەم بکەم».

دەشیوت: «ئێستا پیربومەو ناتوانم مێردەکەم نەخۆشەو لەسەر جێگایە خزمەتی ئەکەم».

بەتاسەوە وتی: «لەمناڵەکانم دا، مناڵی خۆمم بیر دەکەوتەوە کەدایکم خۆشی نەویستم بۆ ئەوەی لە کوڵی خۆیم بکاتەوە بەو مناڵییە دامیان بەشو بەو پیاوە گەورەیە، بۆیە مناڵەکانمم زۆر خۆشەویست و گرنگیم پێیان دا، ئێستا هەمویان لەسەر ژیانی خۆیانن و خوێندنیان تەواوکردوەو حاڵیان باشە».

# ژن و یاسا ... دەستکەوتی زۆر و ئاواتی زۆر تر



■ ژیلا تۆفیق

**پێشێلکردنی مافی ئافرەت لە کوردستان دا جیاوازە لە پێشێلکردنی مافی ئافرەتی وڵاتانی تر، چونکە ئافرەتی کورد لەلایەک لەرێگەی دابونەریەتەوە مافی پێشێل کراوە، لەلایەکیش وەکو مرۆڤ مافی پێشێل کراوە.**

وردەکاری پێشێلکارییەکانی مافەکانی ژنان زۆرن و زۆریشی لەبارەوە وتراوە، بۆیە من نامەوێت ئەو قسانە دوبارە بکەمەوە، بەڵکو ئەوەی من دەمەوێ ئاماژەی بۆ بکەم ئەوەیە کە کاریگەرترین رێگا بۆ فەراهەمکردنی مافی ئافرەت ئەو یاسایانەیە کە لە رێگای پەرلەمانەوە دەردەکرێت، چونکە ئەمە وادەکات زەمینەیەکی یاسایی بخوڵقێت و لەروی یاسایی و دەستوریەوە مافەکانی ژنان بونیان هەبێت، ئەوکات دەمێنێتەوە سەر جێبەجێکردنیان.

لەهەرێمی کوردستان، ئەوەی مایەی خۆشحاڵییە ئەوەیە کە لەم چەند ساڵانەی رابردودا مافەکانی ژنان لە یاسادا بەرەوپێشەوەچونی باشی بەخۆیەوە بینیوەو بە هەوڵ و فشاری کەسانی ئازادیخواز و چالاکوانانی ژنان و کۆمەڵی مەدەنی و رێکخراوەکان، توانراوە چەند بڕیار و بڕگەیەکی یاسایی لەبارەی پرسەکانی ژنانەوە بدرێت، کە ئەمەش بەشێکی بەرچاو لە مافەکانی ژنان بەدیی دێنێت.

لەخوارەوە، ئاماژە دەکەم بەدیارترین ئەو گۆڕانکارییانەی لە یاساو بڕگە یاساییەکان دا لەبارەی مافەکانی ژنانەوە لەهەرێمی کوردستان کراون، کە هەندێک لەو هەنگاوانە گۆڕانکارییکردنە، هەندێکی دیکەیان هەمواری یاسا و هەندێکی تر دەرچواندنی یاساو هەندێکی تریش راگرتن یان لەکارخستنی چەند یاسایەکن کە دژن بە مافەکانی ژنان.

یەکەم: یاسای ژمارە (٧)ی ساڵی ٢٠٠١، کە دەقەکە بریتیە لە: (ئافرەت بەدەردەکرێت لەحوکمەکانی برگە (١) لەمادەی (٤١) لە یاسای سزادانی عیراقی ژمارە ١١١ سالی ١٩٦٩ هەموارکراو). ئەم یاسایە لەبڕگە (١) مادە (٤١) رێگەی داوە بە پیاو هەستێت بە «تەمبێکردنی ژنەکەی لە چوارچێوەی ئەو سنورەی شەرع و یاساو دابونەریت بڕیاری لێداوە».

دوەم: یاسای ژمارە ٨ ساڵی ٢٠٠١. ئەگەر پیاو ژنەکەی تەڵاق دا و بۆ دادگا رون بوەوە کە پیاوەکە بە ستەمکردن ژنەکەی تەڵاق داوە و لە ئەنجامی ئەو تەڵاقدانەش ژنەکە زیانمەند بوە، دادگا لەسەر داوای ژنەکە بریاردەدات مێردەکە هەستێت بە قەرەبوکردنەوەی ژنەکە بەشێوەیەک لەگەڵ باری دارایی و گوزەران و پلەی ستەمەکە بگونجێت و پێکەوە دەخەمڵێندرێت، بەڵام دەبێت بڕی قەرەبوەکە لە بژێویەکەی کەمتر نەبێت و ماوەی قەرەبوەکەش لە دو ساڵ کەمتر نەبێت و لە ٣ ساڵ زیاتر نەبێت، سەرەڕای مافە چەسپاوەکانی دیکەی ژنەکە.

سێیەم: یاسای لێبوردنی ژمارە (٤) ی ساڵی ٢٠٠٧. لە مادەی (٧) لە یاساکە ئەو تاوانبارانەی دیاری کردوە کە ئەم لیبوردنە نایانگرێتەوە و لەنێویشیاندا ئەو کەسانە هەیە کەتۆمەتبارن بەکوشتنی ژنان بەبیانوی شەرەف پارێزی. وەک کە لە هەردو بڕگەی (١٠و١١) لە مادەکەدا هاتوە، لێبوردن ئەنجامدەرانی ئەم تاوانانە ناگرێتەوە: «دەستدرێژی سیکسی، نێربازی، داوێنپیسی (زینا) لەگەڵ پێنەشیاوەکان و کوشتن بەبەهانەی پاڵنەری ئابڕو (غسل عار).»

کەواتە لیبوردنەکە ئەو کەسانە بەدەر دەکات کە بەناوی ناموسەوە ژنان دەکوژن.

چوارەم: راگرتنی یاسای ژمارە (١٨٩)ی ساڵی (١٩٨٠) کە دەڵێت: (رێگەپێدان بە هاوسەرگیری لەگەڵ ژنی دوەم بەبێ مۆڵەتی دادگا ئەگەر هاتو بێوەژن بێت). ئەم یاسایە لە هەرێمی کوردستان راگیرا بەپێی یاسای ژمارە (١٠)ی ساڵی ٢٠٠١.

پێنجەم: بەپێ یاسای راژەی شارستانی ژمارە (٢٤)ی ساڵی (١٩٦٠) هەموار کراو، مۆڵەتی دایکایەتی دەدرێت بە فەرمانبەری ئافرەت بۆ چاودێریکردنی مناڵەکەی بۆ ماوەی ساڵێک (٦ مانگ بە موچەی تەواو و ٦ مانگ بە نیو موچە)، بەڵام لە کوردستان کار بەو برگەیە ناکرێت لەو یاسایە و بەپێی یاسای ژمارە (٢٣)ی ساڵی ٢٠٠٣ لە هەرێمی کوردستان (ئەو ئافرەتەی لە مۆڵەتی مناڵبون یان دایکایەتی بێت بە درێژایی ماوەی مۆڵەتەکەی موچەو دەرماڵەی تەواوی پێدەدرێت).

ئەمانە نمونەیەکن لەو دەستکەوتە بەدیهاتوانەی لە مافەکانی ئافرەتان لە هەرێمی کوردستان بەدیهاتون، ئەگەرچی وەک دەوترێت عیبرەتی یاسا لەجێبەجێکردنی دایە، بەڵام بونی زەمینەی یاساییش بەشێکی گرنگە لە چەسپاندنی مافەکانی ئافرەتان.

بونی ئەم بەرەوپێشەوەچونانەش لە رەوشی مافەکانی ئافرەتان لە یاسادا، ئەگەرچی دڵخۆشکەرە، بەڵام دەبێت هاندەریش بێت بۆ زیاتر چەسپاندنی مافەکانی ئافرەتان و بەرقەرارکردنی عەدالەت و یەکسانی رەگەزیی.

# وەرزش بۆ ژنان پێویستییە یان کات کوشتن؟





■ فاتمە ئەحمەد
راهێنەری وەرزشی ژنان

**دیارە وەرزش بەتەنیا پێویستیەکی فسیۆلۆژی نیە بەڵکو چەندین سوودی دەرونیشی هەیە لەوانە متمانەو باوەڕ بەخۆبون لەلای کەسی وەرزشکار دروست ئەبێت بەوەی لەشولارێکی تەندروست و جوانی هەبێت.**

وەرزش جیهانێکی فراوان و تایبەت بەخۆی هەیە و دەیان جۆر وەرزش بوونیان هەیە، ئێمە لێرەدا لە سەر وەرزشی تایبەت بە تەندرستی و لەشجوانی ئەدوێین کە پێویستیەکی رۆژانەن. ئەم جۆرە وەرزشە دیارە لە وڵاتانی رۆژئاوا رەگی کلتوری هەیە و زۆرینەی خەڵکی رۆژانە وەرزش ئەنجام دەدەن بەبەراورد بەسەرقاڵی و کاری رۆژانە چالاک و لەهەمانکاتدا ئارامیان پێ دەبەخشێت و لەکەشێکی دەروونی باشتردا کارەکان رایی دەبێت.

خاڵێکی تر کە جێگەی سەرنجە خەڵکی لێرە وەرزش بە جۆرێک لە ماندو بون دەزانن، بەڵام وەرزش هەم مرۆڤ چالاک دەکات و هەم ئارامیش (یۆگا) بە مرۆڤ دەبەخشێت. واتا جۆرێتی وەرزشە ئەو ئەنجامانە دەستەبەر دەکات کە فێرخواز پێویستی پێیەتی.

لێرەدا دوو پرسیار دێنە پێش ئایا بەکلتور بوونی وەرزش پێویستە؟ ئایا ژنان بەتایبەت لە گەرمیان ڕێگەیان پێدراوە وەرزش ئەنجام بدەن بە پێی رێنمای کەسانی شارەزا لە دەرەوەی ماڵ یان هۆڵی تایبەت؟

بێگومان بەکلتوربونی وەرزش پێویستیە، مرۆڤ بە هەمانشێوەی خواردن و خەوتن و پێویستیەکانی تری رۆژانە، پێویستی بەوەرزشێکی بەرنامە بۆ دارێژراو هەیە بۆ بەتەندروست و چالاک مانەوەی خود، چونکە کۆمەڵگەی پێشکەوتو و رۆشنبیر پێویستی بەکەسانی چالاک هەیە.

هەرچی سەبارەت بە پرسیاری دوەمیش هەیە بەداخەوە رێژەی بەشداریکردنی ژنان لە وەرزشی تایبەت بەخود زۆر کەم و لاوازە، دیارە بەشێکی بۆ بە پێویست نەزانینێتی لەلایەن خانمانەوە و بەشێکی تریشی رێگەپێنەدانی ژنانە لەلایەن خێزانەوە بێگومان هۆی ئەمەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە وەرزش تایبەت بە پیاوان سەیر دەکرێت و وەک شتێکی نامۆ بە ژنان و ئەمەش پەیوەندییەکی ریشەی و راستەوخۆی بە کلتورەوە هەیە. هەر دیاردەیەکی نوێ لەکۆمەڵگای دواکەوتودا پێویستی بە قوربانی و ماوەیەکی زۆرە تابەشێکی لە چەمکی کلتور پێ ڕەوا ببینرێت.

لە میانەی گفتوگۆکانماندا لەگەڵ ژنان گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە زۆربەیان رێگریان لێدەکرێت یان بەهۆی قسەی دەوروبەرەوە کە بەشتێکی ناپێویستی دائەنێین و چەندین هۆی نەریتی تر کە رێگرن لە پێش ژنان وهیچ خاڵێکی لۆژیکیان تیا بەدی ناکرێت.

لێرەدا پرسیارێکی تر دێتە بون ئایا ئەگەر ژنان لە وەرزش داببرێن کۆمەڵگا دواکەوتو دەبێت؟

بێگومان ئەمە وەڵامێکی رێژەییە، بەڵام هەر دابڕانێک و داتاشینی مرۆڤ لە پێویستیەکانی ژیانی مرۆڤ بەرەو داڕوخانی هزری و فسیۆلۆژی دەبات بەتایبەت کە وەرزش پەیوەندییەکی راستەوخۆ و گشتگیری لە گەڵ سروشتی مرۆڤدا هەیە، هەروەها خانمانیش کە هەندێ ئەرکی قورس و ماندوکەریان لەسەر شانە چ بەهۆی کاری ماڵ یاخوە دەرەوە، پێویستیان بەوزەی پۆزەتیڤ و هزرێکی چالاک و دەرونێکی ئارام هەیە.

# لە گەرمیانەوە بۆ شەنگال



■ گوڵباخ حەسەن

**چەند لەیەک دەچن تاوانەکان، چەند هاوشێوەن قوربانیەکان و چەندیش وەکو یەکن تاوانباران! کات و جوگرافیا، ناتوانن ئەو لێکچونانە بسڕنەوە کەلەنێوان جینۆسایدی ئەنفال و جینۆسایدی ئێزیدییان دا هەیە.**

کە لەمیانی بەدواداچونێک بۆ کەیسی کچانی یەخسیرکراوی ئێزیدیی لای داعش چاوم بەژمارەیەک لەو قوربانیانە کەوت کەلە تونی مەرگ و لە مۆڵگەی رەشی تیرۆرستانی داعش گەڕابونەوە، لە چیرۆکەکانیان دا هاوشێوەییم ئەبینی لەگەڵ ئەوانەی ئەنفال.

(سارا) کچە ئێزدیەک بو کە داعش بەکۆیلەی گرتبو، بەدرێژایی مانەوەی لەلایان دەستدرێژی کرابوە سەری، خۆی دەربازی بو، بەڵام تائێستا چارەنوسی سەرجەم ئەندامانی خێزانەکەی نادیارە.

بەدەم هەنسکی گریانەوە وتی: ئەوان ئێمەیان کردە قوربانی، نەیاتوانی بەرگریمان لێ بکەن و رادەستیان کردین تا ئەو درندانە لاقەمان بکەن و دەستدرێژیمان بکەنە سەر و کڕین و فرۆشتنمان پێوە بکەن.

وتی: ئەو کاتانەی داعشەکان پەلاماریان دەدام، لەدڵی خۆمەوە ئەموت ئەبێ ئێستا بەرپرس و فەرمانڕەواکانمان لەکوێ بن؟ ئەبێت چی بکەن و هەستیان چی بێت کەئێمەیان بەو دەردە برد؟ تۆ بڵێی زریکەی من ویژدانی سەرانی کوردی بەخەبەر بهێنێت؟!

وتیشی: ئێمەیان دا بەدەمی گورگەوەو خۆشیان دەستبەردانی ژیانی رەفاهیەتی خۆیان نەبون. ئەوان بۆ رزگارکردنیشمان نەیان توانی بڕێک پارە کە دەکاتە بایی دانیشتنی خواردنەوەیەکی شەوانەیان بدەن و ئێمەی پێ رزگاربکەن، هەتا کەسوکارەکانمان بەسواڵ و ساقەو هاوکاری رزگاریان کردین.

کە چیرۆکی (سارا)م بیست، یەکسەر بە بیر گەڕامەوە بۆ چەند ساڵێک لەوەو پێش و شوێنێکی دورتر لەشەنگال، گەڕامەوە بۆ گەرمیان و قسەی شێرە ژنێکی رزگاربوی ئەنفال کەچەند ساڵێک پێش ئەوە بۆی کردبوم.

ئەو وتی: بەرپرسەکان چیان پێنەکردین؟ لەبری چاکەو پاداشت دانەوە هیچ نەما بۆ سوککردنمان نەیکەن.

وتی: بیرم ناچێت کە ئێمە هەرچی سەرو ماڵمان هەیە رۆیشتبو و هەمومان چەندین خۆشەویستمان لەدەستدابو، پاشانیش برسی و بێ کۆمەک و هاوکاری دانیشتبوین، کەچی ئەوان بەچاوی تەماعەوە تێمانیان دەڕوانی و هەوڵی ئیستغلالکردنیان دەدایین.

وتیشی: کاتیک ئەوان لە شاخ برسیبون، ئێمە ژیانی خۆمانمان ئەخستە مەترسیەوە بۆ ئەوەی ئەوان برسی نەبن و لەشۆڕش بەردەوامبن، کەچی کە دەوران گۆڕا، برسیبونی ئێمەیان قۆستەوەو وەک درندە پەلاماری شەرفمانیاندا، ئەو شەرەفەی کە نەک هی ئێمە، بەڵکو هی هەمو میلەت بو، شەرەفێک بەعس نەیتوانی لەکەداری بکات!

رەنگە وتنی ئەم دێڕانە قورس و سەخت بن، چونکە هەمیشە حەقیقەتەکان لە پێناو لایەنگیریدا لەناو بڕاون، بەڵام پێموایە بۆ مێژو ئەبێ شتەکان وەک خۆیان بنوسرێنەوە!

# «کێشەی هۆرمۆنی ژنان فرە هۆکارەو پەیوەندی بە یەک هۆکارەوە نییە»

▪ نەوژین،
سوزان خەلیل- سەرگوڵ خەلیل

**بەشێک لە ژنان کێشەیان لە هۆرمۆن دا بۆ دروست دەبێت، کە ئەمەش سەردەکێشێت بۆ دەرچونی موی زیادە لە لەش و روخساریان کە لەگەڵی دا کێشەی دەرونیان بۆ دروست دەکات. لەم دیدارەدا، د. دلێر رەزا عەبدولکەریم، پسپۆری نەخۆشیەکانی پێست و جوانکاری و نەشتەرگەری پێست و چارەسەر کردن بە لیزەر، زانیاریی زیاترمان پێدەدات لەبارەی ئەو کێشەیەوە.**

> لابرنی موی زیادە بە گوێزان یان مەکینە باشترە لە هەڵکێشان




**هۆرمۆن چیە؟**
هۆرمۆن مادەیەکی پرۆتینیە بڵاو دەبێتەوە بەسەر ئەندامەکانی لەشدا لە رێگەی خوێنەوە بۆ جێبەجێ کردنی فرمانێکی تایبەت وەک هەڵگری نامەیەک بۆ مەبەستێک.

**هۆرمۆن چەند جۆرە؟**
جۆرەکانی هۆرمۆن بەگشتی بریتین لە هۆرمۆنی رژێنی ژێر مێشک و هۆرمونی رژێنی دەرەقی و هۆرمۆنی رژێنی سەر گورچیلە و هۆرمۆنی رژێنی هێلکەدان لە ئافرەتان و هۆرمۆنی رژێنی گون لە پیاوان.
هەریەک لەم رژێنانە هۆرمۆنی تایبەت دەردەدەن و دەرژێنە ناو خوێنەوە بۆ رێکخستنی فرمانێکی تایبەت بەهەر یەکەیان هەڵبەتە تێکچونی هەریەک لەم هۆرمۆنانە دەرکەوتنی نیشانە گەلێکی تایبەتی نەخۆشیەک.

**بۆچی رو دەدات؟**
هۆرمۆن بەرێژەیەکی ئاسایی لە لەشدا پێویستە بۆ رێکخستی فرمانەکانی لەش هەڵبەتە رو نادات بەڵکو پێویستە هەبێت هەر کاتێک ئەم رێژەیە تێک چو واتە کەم یان زیادی کرد ئەو کاتە دەبێتە هۆی تێکچونی دەرئەنجامەکەشی واتە تێکچونی فرمانی لەش.

**چ هۆرمۆنێک دەبێتە هۆی دەرکەوتنی موی زیادە لە ئافرەتاندا؟**
تێکچونی هۆرمۆنی نێرینە تیستێستیرۆن و DHEA_S کە لەلایەن رژێنی سەر گورچیلەوە دەردەرێت، لە ئافرەتاندا رژێنی هێلکەدانی ئافرەتان LH و FSH دەبێتە هۆی دەرکەوتنی موی زیادە لە دەمو چاو لەشی ئافرەتاندا هەڵبەتە ئەمە تەنیا هۆکار نیە بۆ دەرکەوتنی موی زیادە لە ئافرەتاندا.

**چی دەبێتە هۆی تێکچونی ئەم هۆرمۆنە؟**
تێکچونی هۆرمۆن بە تەواوەتی هۆکارەکەی نەزانراوە کەچی رۆڵێک دەبینێت، هەروەها هۆکاری تری دەرەکی رۆڵ دەبینێت لەوانە قەڵەوی و فشاری دەرونی و دەرمان و نەخۆشی کیسی هێلکەدان، بەمانایەکی تر هۆکارێکی رونی نیە زۆربەی جار.

**ئایا خواردن کاریگەری لەسەری هەیە بۆ نمونە هەندێک دەڵێن بەخواردنی چەوری، موی زیادە لەسەر روخسارم دەرکەوتوە؟**
خواردن کاریگەری راستەوخۆی نیە مەگەر ناڕاستەوخۆ، نمونە خواردنی زۆری چەوری و شیرینی بۆ توش بون بەقەڵەوی ئەمەش هۆکارێکە بۆ تێک چونی هۆرمۆن و نەخۆشی کیسی هێلکە دان.

**لەپێشودا کەم ئافرەت توشی ئەم نەخۆشیە دەبون، بەڵام لەئێستادا ژمارەی توشبوان هەستدەکرێت زۆرترە، ئەمە هۆکاری چیە ؟**
شتێک هەیە پێی ئەوترێت لایف ستایل واتە جۆری ژیان، رەنگە خەڵکی جاران لایف ستایلیان تەندروست تر بوبێت لە خەڵکی ئێستا، جوڵە و وەرزش و خواردنی تەندروست و قەڵەو نەبون و کەمی فشاری دەرونی خەڵکی پێشو هۆکارێک بون بۆ کەمتر توش بون بەم حاڵەتە، هەڵبەتە داتایەکی وردیشمان لەبەردەستدا نیە بۆ پشتراستکردنەوەی ئەم قسەیە. هۆکارێکی تری ئەوەیە خەڵکی زیاتر لە خەڵکی جاران گرنگی ئەدەن بەجوانی و بەدوای چارەسەردا ئەگەڕێن ئێستاش پزیشک و سەنتەری تایبەت بۆ چارەسەر کردنی ئەم حاڵەتە ئاسانتر دەست دەکەوێت.

**ئەم نەخۆشیە چارەسەری هەیە واتە جگە لە لیزەر کردن بە هیچ شتێکی تر چارەسەر ئەکرێ؟**
سەرەتا پێویستە بە دوای هۆکارەکەیدا بگەڕێی واتە لە رێی زانیاری تەواو لەسەر مێژوی نەخۆشیەکە و پشکنینی تیشک و سۆنارەوە هۆکارەکەی دیاری بکرێت، لەکاتی دۆزینەوەی هەر تێکچونێک لە هۆرمۆن یان هەر نەخۆشیەکدا پێویستە چارسەر بکرێت بەدەرمان و وەرزش و کەمکردنەوەی کێشی لەش و چارەسەر کردنی تێکچونی باری دەرونی نەحۆشیەکە و دڵنەوای کردنی نەخۆشەکە و لەگەڵ هەمو ئەمانەشدا لیزەر چارەسەرێکی باشە بۆ لابردنی موە زیادەکان.

**هەندێک لە ژنان دەڵێن حەپی دژە سکپڕی «منع»م بەکار هێناوە و هۆرمۆنم تێکچوە، ئایا ئەمە هیچ کاریگەریەکی لەسەر هەیە؟**
حەپی مەنع بۆ خۆی هۆرمۆنە بۆیە ئەبێتە هۆی تێکچونی هۆرمۆن و هۆکارێکە بۆ دەرکوتنی موی زیادە لە لەشی ئافرەتاندا.

**ئایا بە هەڵکێشانی ئەو موانەی بەهۆی هۆرمۆنەوە دروست بوە زیاد ئەکات یان هەر وەکوخۆی ئەمێنێتەوە؟**
لابرنی موی زیادە بە گوێزان یان مەکینەی سفری ریش تاشین باشترە لە لابردن بە رێگەی هەڵکێشان یان لابردن بە رێگەی شیلە. لێرەدا بە فرسەتی دەزانم ئەو بۆچونە هەڵەیە پشتراست بکەمەوە کە دەڵێن بەلابردنی مو بە گوێزان یان بە موس ئەبێتە هۆی ئەستور بون و رەق بونی مو کە لەراستیدا ئەم بۆچونە هیچ بنەمایەکی زانستی نیە و راست نیە.

**ئێوە رێنمایتان چیە بۆ ئەو ئافرەتانەی توشی ئەم نەخوشیە بون؟**
دور بکەونەوە لە فشاری دەرونی و هەوڵی باشتر کردنی دەرونی خۆیان بدەن و وەرزش بکەن و کێشی لەشیان کەم بکەنەوە. هەروەها لەکاتی حاڵەتی نەخۆشی و کێشەی تەندروستی دا سەردانی پزیشکی پسپۆری نەخۆشیەکان بکەن بۆ دیاری کردنی هۆکاری نەخۆشیەکە و چارەسەر کردنی بە رێگەیەکی زانستی.

---

# هەزاران ژن و یەک پزیشک

## ئافرەتانی کفری کێشەی کەمی پزیشکی نەخۆشیەکانی ژنان و منداڵبونیان هەیە




▪ نەوژین، ئومێد زەنگەنە

**نەخۆشخانەی شەهید خالید گەرمیانی کێشەی کەمی پزیشکی پسپۆڕی تایبەت بەئافرەتانی هەیە و ئافرەتانی کفریش بەناچاری بۆ وەرگرتنی چارەسەری پێویست لەو نەخۆشیانەی پەیوەندیان بە ئافرەتان و منداڵبونەوە هەیە، سەردانی قەزای کەلار دەکەن.**

نەخۆشخانەی شەهید خالید گەرمیانی لەکفری، ئەو نەخۆشخانەیەیە کە تەنها یەک پزیشکی ئافرەتی تێدایە و بەوتەی ئافرەتانی سنورەکەش بەشی ئافرەتان و منداڵبون لەنەخۆشانەکەدا خزمەتی وەکپێویست نییە.
نوخشەعوسمان، کە یەکێکە لە کارمەندانی بەشی ئافرەتان و منداڵبون لەنەخۆشخانەکە، بۆ (نەوژین) وتی: «نەبونی پزیشکی تایبەت بەنەخۆشیەکانی ئافرەتان و پزیشکی نەشتەرگەری سەرچاوەی کێشەکانمانە، هەمو هەوڵێکیشمان داوە بۆ ئەوەی بتوانین باشترین خزمەت بەو ئافرەتانە بکەین کە رۆژانە سەردانمان دەکەن».
نوخشە، درێژە بەوتەکانی دەدات و دەڵێت: «لەروی کەرەستە و شوێنەوە تاڕادەیەک بەگوێرەی نەخۆشخانەکە کێشەیەکی ئەوتۆمان نییە، هەوڵیشمان داوە بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان، بۆیە هەر ئافرەتێک بۆمناڵبون سەردانمان بکات مەترسی لەسەر ژیانی نەبێت لەسەر بەرپرسیارێتی خۆی کاری پێویستی بۆ ئەنجام دەدەین».
شەیما محەمەد، ژنێکی قەزای کفریەو بۆ وەرگرتنی چارەسەر سەردانی نەخۆشخانەکەی کردوە. بۆ (نەوژین) باسی لەو کێشە و گرفتانە کرد کە لەنەخۆشخانەکەدا توشی دەبن «لەکاتی پێویستدا کەسەردانی ئەم نەخۆشخانەیە دەکەین پزیشکی تیدانییە و خزمەتەکانی وەکپێویست نییە و وەکپێویستیش چارەسەر وەرناگرین».
وتیشی: «لێرە نەخۆش راناگیرێت و رەوانەی نەخۆشخانەی شەهید شێرەی نەقیب دەکرێت لە کەلار.»
لەبەرامبەریشدا، بەڕێوبەری نەخۆشخانەی شەهید خالید گەرمیانی لەکفری، هێمن محەمەد رۆستەم، دانی بە بونی کێشە و کەموکورتی دا نا لەو بوارەی پەیوەندی هەیە بە ژنان و منالبونەوە.
بۆ (نەوژین) وتی: «نەک تەنها پزیشک بەڵکو بەشی ئافرەتان و منالبونی نەخۆشخانەکەمان لە روی کارمەندیشەوە کێشەی هەیە، تەنها یەک پزیشکی ئافرەتانمان لەنەخۆشخانەکەدا هەیە کەئەمەش بەشی پێویستی نەخۆشخانەکە ناکات بەتایبەت کەبەهۆی قەیرانی داراییەوە دەوامی پزیشکانیش کەمی کردوە».
بەڕێوبەری نەخۆشخانەکە ئاماژە بە پێویستی دروستکردنی نەخۆشخانەیەکی تایبەت بەئافرەتان ومناڵبون دەکات لەکفری و دەڵێت: «زیاتر کێشەکان لەدوای دەوامی ئاسایی دەبێت، چونکە لەدەوامی بەیانیاندا پزیشکی راوێژکاری هەیە، بەڵام لەدوای دەوامی ئاسایی ئەو ئافرەتانەی کەپێویستیان بەنەشتەرگەری یاخود چارەسەری دیکە هەیە، پزیشکی پێویست نیە بیانبینێت و پێویستمان بە نەخۆشخانەیەکی تایبەتمەند بەبواری ئافرەتان ومناڵبون هەیە هاوشێوەی نەخۆشخانەی شەهید شێرەی نەقیب لەکەلار، کە لەئێستادا نەخۆش رەوانەی ئەوێ دەکەین».
سەبارەت بەهەوڵەکانیان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان، بەڕێوبەری نەخۆشخانەی شەهید خالید گەرمیانی وتی: «داوامان کردوە لە بەڕێوبەری گشتی تەندروستی گەرمیان هەرکاتێک کە پزیشکی پسپۆڕ لەهەر بوارێکدا دامەزرا بۆ نەخۆشخانەکەمانی بنێرێت».

> لەکاتی سەردانی نەخۆشخانەکە پزیشکی تیدانییە و چارەسەری پێویستی نیە

سارا، کەناوی خوازراوی ژنێکی دیکەی سەردانکەری نەخۆشخانەکەیە، ئاماژەی بەوەکرد کە نەخۆشخانەی شەهید خالید گەرمیانی نەک هەر بەشی ژنان، بەڵکو هەمو بەشەکانی تریشی، خزمەتگوزاری و پزیشکیان وەکو پێویست نییە.
وتیشی: « ئێمە بەناچاری بۆ وەرگرتنی چارەسەر دەبێت سەردانی کلینکە پزیشکیەکان بکەین، لەم بارودۆخەشدا کەقەیرانی داراییە هەمو کەس وەکپێویست ناتوانێت سەردانی کلینکی پزیشکی بکات.»
لایخۆشیەوە، د.سیروان محەمەد جەمال، بەڕێوبەری گشتی تەندروستی گەرمیان، سەبارەت بەم پرسە وتی: «نەخۆشخانەی شەهید خالید گەرمیانی هەمیشە هەوڵمانداوە پزیشکی پسپۆڕی بۆدابین بکەین، بەڵام بەهۆی دواکەوتنی دامەزراندنی پزیشکەوە تاوەکو ئێستا نەمانتوانیوە پزیشک بۆ هیچ جێگایەک دابین بکەین».
ئاماژەی بەدامەزراندنی پزیشکانیش کرد و وتی: «لەئیستادا بەبەبریارێکی ئەنجومەنی وەزیران هەندێک پزیشکمان بۆدامەزراوە، چەند پزیشکێکیش لەم پزیشکانەی کە دادەمەزرێن رەوانەی نەخۆشخانەی کفری دەکەین بەئامانجی چارەسەرکردنی گرفتەکە و پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی کە لەو بوارەدا هەیە».

# جوانە .. لە خۆشترین شاری ئەوروپاوە بۆ جەنگان دژی داعش

■ نەوژین

**کۆپنهاگن، پایتەختی وڵاتی دانیمارک، بەیەکێک لە خۆشگوزەرانترین شارەکانی ئەوروپا و جیهان هەژمار دەکرێت. بەڵام کچێکی خوێندکاری گەنجی ئەم شارە، بڕیار دەدات ژیانی ڕەفاهیەت بەجێبێڵێت و ڕو لەکوردستان بکات، ئەویش بەئامانجی بون بە چەکدار و شەڕکردن لەدژی ڕێکخراوی «داعش».**

لەکۆتاییەکانی ساڵی ٢٠١٤ دا، جوانە پاڵانی، سەرقاڵی درێژەدان بو بە خوێندنی خۆی لە پایتەختی وڵاتەکەی دانیمارک، بەڵام کاتێک گوێبیستی ئەو تاوان و کوشت و بڕە بو کە چەکدارانی «داعش» دژ بە ژن و منداڵ و هاوڵاتیانی سڤیلی عێراق و سوریا دەیکەن، وازی لە هەمو شت هێناو ڕوەو عێراق بۆ جەنگان لەدژی ئەو ڕێکخراوە تیرۆرستیە کەوتەڕێ.

جوانەی تەمەن (٢٣) ساڵ، پاش بەجێهێشتنی گۆپنهاگن، پەیوەندی بە یەکەکانی پاراستنی گەلی کوردستان لە ڕۆژئاوای کوردستان و هێزەکانی پێشمەرگە لە باشوری کوردستانەوە کردوە.

بەڵام ئەوەی چاوەڕەوان نەکراو بو بۆ ئەو، دەرەنجامی کارەکەی لەوڵاتەکەی خۆی بەپێچەوانەوە کەوتەوە، چونکە پاش تەواوکردنی ئەرکی بەرگریکردن لە داعش و بەرەنگاربونەوەی، لەکاتی گەڕانەوەی دا وەکو «تیرۆریست» مامەڵەی لەتەکدا کراوە، بەوهۆیەی سەفەری بۆ هەریەکە لە عێراق و سوریا کردوە کە جەنگێکی گەورەی تیادا بەڕێوەدەچێت دژ بە داعش.

جوانە پاڵانی، لە دیداری دا لەگەڵ ڕۆژنامەی «میرۆر»ی بەریتانی، سەرسوڕمانی خۆی پیشاندەدات لەمامەڵەکردن لەگەڵی دا وەکو «تیرۆریست» لەکاتێکدا ئەو دژی تیرۆرستان جەنگاوە تەنانەت بەوتەی خۆی ١٠٠ چەکداری داعشیشی کوشتوە و هاوکاریەکی زۆری ئەو ژن و منداڵانەی کردوە کەداعش کردبونی بەکۆیلەی سێکسی.

ئەوەشی وت کە جگە لەکاری چەکداری و بەرەنگاربونەوەی چەکداریی، هاوکاریەکی زۆری ژنانیشی کردوەو فێری شێوازی خۆپارێزی و بەرگریکردن لەخودی کردون.

جوانە، باسی لەوەکرد هەر پاش گەڕانەوەی بۆ وڵاتەکەی خۆی (دانیمارک) لەساڵی ٢٠١٥ دا، ڕوبەڕوی دادگا کراوەتەوە بەتۆمەتی جەنگان و بەشداریکردن لە کاری چەکداری لەدەرەوەی وڵات، بەڵام پارێزەرەکەی (جوانە) ئەم تۆمەتە بۆ کچێک کەبەرەنگاری داعش بوبێتەوەو دژیان جەنگابێت، بە «شەرم و ئابڕوچون» وەسف دەکات.

جوانە، ئاماژە بەوەدەکات کە ئەو کاتێک بڕیاری داوە ببێتە شەڕڤان و پێشمەرگە و دژ بە داعش بجەنگێت، بەوهۆیە بوە کەویستویەتی «داکۆکی لە مافەکانی ژنان و دیموکراسی بکات، هەروەک داکۆکی لەو بەهایانەش بکات کەوەکو کچە دانیمارکیەک لەسەری گۆش کراوە».



ئەم کچە شەڕڤانە، لە ساڵی ١٩٩٣ لە شاری ڕومادی خۆرئاوای عێراق و لەکەمپی کوردانی ئاوارەی ڕۆژهەڵات لە «ئەلتاش» لەدایکبوە، بەڵام لەتەمەنی ٣ ساڵی دا خێزانەکەیان هەمویان بەرەو دانیمارک کۆچیان کردوە.

جوانە باس لەوەدەکات کەپاش گەیشتنەوەی بەدانیمارک بە سێ ڕۆژ، پۆلیس نامەی ئاگادارکردنەوەیان بۆ ناردوە کە پاسپۆرتەکەیان لەکارخستوەو ناتوانێت چیتر بۆ دەرەوەی وڵات گەشت بکات، ئەمەش وایکردوە کەنەتوانێت جارێکی دیکە پەیوەندی بە هێزە کوردیەکان بکاتەوە بۆ جەنگان دژ بە داعش، بۆیە جارێکی تر گەڕاوەتەوە سەر خوێندنەکەی لەبەشی فەلسەفەو زانستی سیاسی.

## دەربارەی نەوژین

نەوژین، ڕۆژنامەیەکی سەربەخۆی تایبەتمەندە بە پرسەکانی ژنان، مانگانە لەلایەن ڕادیۆی دەنگ لە گەرمیان بڵاودەکرێتەوە.

ڕادیۆی دەنگ، پرۆژەیەکی میدیایی سەربەخۆیە لە ناوچەی گەرمیان، لە ٢٠١٠ وە بە پەخشی ڕادیۆیەکی لۆکاڵی دەستی پێکردوەو پاشان وێبسایتێکی داناوە.

ڕۆژنامەی نەوژین یەکێکە لە چالاکیەکانی پرۆژەی ڕادیۆی دەنگ بە پاڵپشتی سندوقی نیشتمانی بۆ دیموکراسی (NED) ئەمریکی.

ڕۆژنامەی نەوژین یەکێکە لە چالاکیەکانی پرۆژەیەکی ڕادیۆی دەنگ کە لەلایەن سندوقەکەوە پاڵپشتیی دەکرێت.

ڕۆژنامەنوسانی ئەم ڕۆژنامەیە، ژمارەیەک کچن کەپێشتر خولێکی ڕاهێنانیان لەلایەن ڕادیۆی دەنگەوە بۆئەنجامدراوەو زۆرینەیان پێشتر کاری ڕۆژنامەوانییان نەکردوە.

بۆ پەیوەندیکردن بە ڕۆژنامەکەوە:
تەلەفۆن:
٠٧٤٨٠٢٠٧٤٠٠
ئیمەیڵ:
nawzhinnewspaper@gmail.com
فەیسبوک:
nawzhinnewspaper

دەتوانن لەماڵپەڕی ڕادیۆی دەنگ کۆپی ئیلیکترۆنی ژمارەکانی ڕۆژنامەکە ببینن
www.radiodang.org

# ٢٠٪ی هاوسەرگیریەکان لەعێراق بە تەڵاق کۆتایی پێدێت

■ نەوژین

**٦٢٥ هەزار حاڵەتی جیابونەوە، لەماوەی ساڵانی ٢٠٠٣ هەتاوەکو کۆتایی ٢٠١٦ لەعێراق تۆمارکراوە، ئەمەش بەپێی ئامارێکی دەسەڵاتی دادوەری عێراقی، بەغدای پایتەختیش لەپێش هەمو شارەکانی دیکەوە دێت لە زۆری ڕێژەی جیابونەوە.**

بەپێی ڕاپۆرتێکی پێگەی «ڕادیۆ سەوا» لەئینتەرنێت، ٢٠٪ هەمو پرۆسەیەکی هاوسەرگیریی لەعێراق، بە جیابونەوە کۆتایی دێت، ئەمەش ژمارەیەکی زۆر و مەترسیدارە لەکۆمەڵگەی عێراقی دا کە ژنان تائێستا خاوەن مافی تەواوەتی خۆیان نین بەتایبەتی ژنانی جیابوەوە.

ڕاپۆرتەکە ئاماژە بەوەدەکات، مانگانە لەنێوان ٤٥٠٠ بۆ ٤٩٠٠ حاڵەتی جیابونەوەو تەڵاقی هاوسەران لە عێراق دا تۆمار دەکرێت.

هەنا ئەدوەر، سکرتێری ڕێکخراوی «امل»ی عێراقی، پێیوایە کەلە پرۆسەی جیابونەوەدا ژنان زەرەرمەندی یەکەمن «چونکە ژنی عێراقی تائێستا خاوەنی سەربەخۆیی ئابوریی نیە، بۆیە جیابونەوە دەیخاتە ژێر گوشارێکی زۆرەوە ئەمە سەرباری ئەو گوشارانەی کەبەهۆی بەکەم سەیرکردنی بێوەژن و ژنانی جیابوەوە لەسەریانە».

هەمان مەترسی، مامۆستای کۆمەڵناسی لە زانکۆی بەغدا، فەوزیە عەتیە، ئاماژەی پێدەکات، بەتایبەتی کە بیروباوەڕی خێڵ و هۆزگەری لەبەرامبەر بیروباوەڕی شارستانی و مەدەنیدا لەم ماوانەی ڕابردودا لەعێراق بەرادەیەکی زۆر گەشەی کردوەو هەژمونی پەیدا کردوە.

## هۆکارەکان جیاوازن

ڕاپۆرتەکە ئەوەی خستوەتەرو کە ٧٠٪ی حاڵەتەکانی جیابونەوە، لەدەرەوەی دادگاکان بەڕێوەدەچن، بەشێوەیەک هەردولا لەنوسینگە «شەرعیەکان» یان لای پیاوانی ئاینی کۆتایی بە گرێبەستی هاوسەرگیرییان دەهێنن، ئەمەش بۆ ئەوەی بەر بگرن بەهەر هەوڵێکی ئاشتەوایی، چونکە دادگاکان پێش بڕیاردان لە جیابونەوەی هاوسەران، دەیاننێرن بۆ ناوەندی تایبەتمەند بە چارەسەرکردنی کێشە خێزانیەکان و ئاشتەوایی، بۆ ئەوەی ئەگەر کرا پێکبێنەوە.



هەربەپێی ئامارەکە، ماوەی هاوسەرێتی زۆرینەی ئەوانەی جیابونەتەوە لە پێنج ساڵ تێپەڕی نەکردوە، هەروەک هاوسەرگیریی پێشوەخت و زوش، هۆکارێکی تری جیابونەوەکانە.

هەنا ئەدوەر، ئاماژەی بەوەکرد کە زوبەشودان یەکێکە لەهۆکارەکان، چونکە چەندین حاڵەتی جیابونەوە لە دادگادا هەبوە کە ساڵی لەدایکبونی هاوسەرەکان ١٩٩٩ یان ٢٠٠١ بون!

هاوکات فەوزیە عەتیە، ئاماژە بەوەدەکات ئەو هاوسەرانە بەهۆی کەم تەمەنی و ئەزمونەوە، هیچ شتێکی ئەوتۆ لەبارەی ژیان و قورسیەکانیەوە نازانن، بۆیە زۆرجار ڕوەو جیابونەوە دەچن، ئەمەش دەگەڕێنێتەوە بۆ خراپی ڕەوشی ئابوری زۆرێک لەخێزانەکان کە بۆ ڕزگاربونیان لە ژیاندنی کچەکانیان، بەشویان دەدەن.

## فەیسبوک!

ڕاپۆرتەکانی دەسەڵاتی داوەری، ئاماژە بە کۆمەڵێک هۆکاری جیاواز دەکات کەدەبنە بنەما بۆ جیابونەوەی هاوسەران، لەوانەش: خراپی ڕەوشی ئابوری، نەگونجانی کەلتوریی نێوان هاوسەران، کۆچ و ئاوارە بون، لەگەڵ هۆکارێکی تر کەبەم تازانە دەرکەوتوە، ئەویش: «تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانە»!

فەوزیە عەتیە، مامۆستای کۆمەڵناسیی لەزانکۆی بەغدا، ئاماژەی بەوەکرد کەنەبونی هۆشیاری ئەوتۆ لەلای تاکەکان بۆ بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، وایکردوە ببێتە هۆیەک بۆ جیابونەوەی هاوسەران.

هەنا ئەدوەر، پێیوایە کە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان کاریگەریان زۆر زیاتر بوە لەپرۆسەکانی جیابونەوە، چونکە وەکخۆی وتی: «جاری واهەبوە لەبەر پۆستێکی فەیسبوک دو هاوسەر لەیەک جیابونەتەوە!»

ئاماژەی بەوەشکرد کەزۆرجار ژنان دەبنە قوربانی ئامرازەکانی تەکنۆلۆژیا، ئەویش کاتێک نامەیەک یان مەسجێکی هەڵەیان بۆ دێت، لەلای خێزانەکانیان خراپ لێکدەدرێتەوەو ئەمەش نەک جیابونەوە، بەڵکو هەندێکجار کوشتنی ژنانیشی لێدەکەوێتەوە.

## کاتێک ژنان داوای جیابونەوە دەکەن

ئامارەکان ئاماژە بەوەدەکەن ٧٠٪ی داواکاری جیابونەوە، لەلایەن ژنانەوە دەکرێت، لەم حاڵەتەشدا یاسا دو بژاردەی لەبەردەم ژنان داناوە، بژاردەی یەکەم ئەوەیە کە جیایان دەکاتەوەو ماف و داواکاریە مادیەکانی بۆ وەردەگرێتەوە ئەگەر ژنەکە ڕوبەڕوی توندوتیژی یان زیانگەیاندن بوبێتەوە یان هاوسەرەکەی بەندکرابێت یاخود پەیوەندی بە گروپە تیرۆرستیەکانەوە کردبێت.

بژاردەی دوەمیش ئەوەیە کە پێی دەوترێت «خلع» واتا کاتێک ژنەکە لەمافی خۆی خۆش دەبێت و هیچی لەمێردەکەی ناوێت لەبەرامبەر جیابونەوەی.

## یاسا یان نەریتەکانی خێڵ

بەڕای (هەنا ئەدوەر)، «یاسای عێراقی بەبەراورد بەیاسای وڵاتی دیکەی عەرەبی پێشکەوتوە»، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کەزۆرجار بەهۆکاری کۆمەڵایەتی و عەشایەری، چاو لە جێبەجێکردنی یاساکان دەنوقێنرێت، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندی بە مافەکانی ژنانەوە هەبێت.

هەروەک باسیلەوەشکرد کە پرۆسەی جیابونەوە لەدادگا، کاتێکی زۆر دەبات و هاوسەرەکان لەچاوەڕوانیەکی زۆردا دەهێڵێتەوە، ئەمەش بۆ خاو کارکردنی دادگان دەگێڕێتەوە.

پێشیوایە ئەگەر دادگا مافی ژن بسێنێت یان نا، ئەوا لەجیابونەوەدا ژنان بەپلەی یەکەم زیانمەندن، بەهۆی ئەو تێڕوانینەی لەکۆمەڵ دا هەیە بۆیان.

سەرسوڕمانی خۆیشی پیشاندا کە «ژنان لەعێراق دا توانیوانە بگەنە پلەی بەرزی وەکو دادوەر و وەزیر و پارلەمانتار کە چارەنوسی میلەتیان بەدەستەوەیە، کەچی کەدێنە ناو خێزانەکانیان ناتوانن بڕیار لە چارەنوسی خێزانەکەی و تەنانەت بڕیار لە چارەنوسی خۆی و ئازادیەکانیشی بدات».

سەرچاوە:
www.alhurra.com

# ژنێک دەبێتە دیپلۆماتکاری بواری زانستیی نێوان هەرێم و ئێران

■ نەوژین، دلێر عەبدولڕەحمان

**بۆیەکەمجار ژنێک دەبێتە دیپلۆماتکاری بواری زانستیی نێوان هەرێمی کوردستان و کۆماری ئیسلامی ئێران و لە یەکەمین دیمانەی رۆژنامەوانیشیدا بۆ (نەوژین) رایدەگەیەنێت زانکۆکانی وڵاتانی دراوسێ بە شێوەیەکی بەرفراوان دەیانەوێ هەماهەنگی لەگەڵ زانکۆکانی هەرێمدا بکەن و بۆئەو مەبەستەش لێرە بەدواوە دەبێت هەمو پەیوەندییەکی زانستی نێوان زانکۆکانی هەرێم و وڵاتی ئێران لە رێگەی منەوە ئەنجامبدرێت.**

د. نەزاکەت حسێن حەمەسەعید، پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە زانکۆی سلێمانی بە (نەوژین)ی راگەیاند: «پێش چەند مانگێک لەلایەن وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژنەوەی زانستی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە، وەکو نوێنەری وەزارەتی ناوبراو بۆ هەماهەنگی پەیوەندییە زانستییەکانی نێوان زانکۆکانی هەرێمی کوردستان و وڵاتی ئێران دەستنیشان کرام و ناوەڕاستی هەفتەی رابردو دەستبەکاربوم».

وتیشی: «یەکەمینجارە ئەم نوێنەرایەتییە لەنێوان هەردولادا دەکرێتەوە و وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی، پێشتر بەشی پەیوەندییەکانی هەبوە، پێش ماوەیەک وەزیری خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی سەردانی وڵاتی ئێرانی کردوە و هەستیکردوە بێ بەرنامەییەک لە رێکخستنی پەیوەندییە زانستییەکانی نێوان هەردولادا هەیە و شپرزەیی پێوەدیارە بۆیە باسی لەوەکردوە کە پێویستە ئەم پەیوەندییە زانستییەی نێوان هەردولا رێکبخرێت».

رونیشیکردەوە: «زانکۆیەکی ئێرانی هاتبون بۆ زانکۆی سلێمانی بۆ هەماهەنگی نێوان هەردولا و بەستنی کۆنفرانس، منیش لە رێگەی ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ ئەو زانکۆیەدا بۆم دروست بو، هەستمکرد هەر رۆژە و زانکۆیەک دێتە زانکۆی سلێمانی، بۆیە پرۆژەیەکم نوسی و پێشکەشی وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستیم کرد، وەزیری ئەو وەزارەتەش دیراسەی کردبو لەگەڵ زانکۆی سلێمانیدا قسەی کردبو هەموان بە باشیان زانیبو، ئیتر بڕیاری دابو من ئەرکی نوێنەرایەتی نێوان هەردو وڵات بۆ کاروباری زانستی لە ئەستۆ بگرم».

دکتۆرە نەزاکەت ئەوەشی وت: «لە ئێستادا کوردستان بەڕوی وڵاتانی دەوروبەردا کراوەتەوە و بەتایبەت زانکۆکانی ئێران لەم دەڤەرەدا بەشێوەیەکی بەرفراوان پرۆژەی هاوبەش لەگەڵ زانکۆکانی هەرێمدا ئەنجام دەدەن».

هەروەها وتی: «هەر زانکۆیەک دەیەوێت هەماهەنگی لەگەڵ زانکۆکانی هەرێمدا بکات یان کۆنفرانس ببەستێت دەبێت پرۆژەکەی پێشکەشی من بکات، منیش ئاراستەی وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی حکومەتی هەرێمی کوردستانی دەکەم تا هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت کە ئایا ئەو هەماهەنگییە یان ئەو کۆنفرانسە بەکەڵکی هەرێم دێت یان نا، بۆئەوەی بڕیاری لەبارەوە بدرێت».




## شاجوانی کوردستان بۆ (نەوژین):

# دەمەوێت هاوکاربم بۆ بەجینۆساید ناساندنی ئەنفال

■ نەوژین

**شاجوانی کوردستان بۆ ساڵی ٢٠١٧ ، لە مەراسیمی ساڵیادی تاوانی ئەنفال دا لەگوندی دێبنەی ناحیەی رزگاری بەشداری کرد و رایگەیاند: «ئامانجی لە بەشداری کردن لە مەراسیمەکەدا هاوخەمی گەیاندنە بەکەسوکاری ئەنفالکراوەکان».**

رۆژی هەینی ٢٠١٧/٤/١٤ لەسەر مەزاری ئەنفالکراوەکان لەگوندی دێبنە بە ئامادەبونی بەرپرسانی حیزبی و حکومی و کەسوکاری ئەنفالکراوەکان، بیست و نۆیەمین ساڵیادی تاوانی ئەنفال بەرێوەچو.

کەسوکاری ئەنفالکراوەکان لەمساڵدا زیاتر جەختیان لەسەر بەجینۆساید ناساندنی تاوانی ئەنفال دەکردەوە، شاجوانی کوردستانیش کە بۆ یەکەمجارە بەشداری مەراسیمی کەسوکاری ئەنفالکراوەکانی کرد بەڵێنی دا بۆ ئەو مەبەستە کار بکات.

ژالیا سیروان، شاجوانی کوردستان، لەلێدوانێکدا بۆ (نەوژین) وتی: «ئامانجم لەبەشداری کردن لە مەراسیمی ساڵیادی تاوانی ئەنفال، هاوخەمی گەیاندنە بە کەسوکاری ئەنفالکراوەکان.»

وتیشی: «دەمەوێت هاوکاری کەسوکاری ئەنفالکراوەکان و لایەنە پەیوەندیدارەکان بم بۆ بەجینۆساید ناساندنی تاوانی ئەنفال.»

(ژالیا سیروان)ی (تەمەن ٢٠ ساڵ)، خەڵکی شاری سلێمانیە و خوێندکاری بەشی ژمێریارییە، شەوی ٧ ی ١٠ ی ساڵی رابردو لەنێو ١١ کچی رکابەردا بەشاجوانی کوردستان هەڵبژێردرا.

ساڵانە و لەمەراسیمی هەڵبژاردنی شاجوانی کوردستان دا، ئەو کچانەی خۆیان بۆ شاجوان هەڵدەبژێرن جگە لە جوانی رواڵەت و جەستە، هاوکات پرسیاریان لەبارەی پرۆژەکانیانەوە بۆ خزمەتکردنی چین و توێژەکانی کۆمەڵگاش ئاراستە دەکرێت و بەوتەی رێکخەرانی مەراسیمەکە، ئەم لایەنە بایەخی زۆری پێدەدرێت.

ژالیا سیروان، لەکاتی سەردانەکەیدا بۆ ناحیەی رزگاریی باسیلەوەکرد کە پرۆژەی بۆ خزمەتکردنی گەنجانی ناوچەکە ئامادە کردوە، بەبێ ئەوەی ئاماژە بە ناوەڕۆکی پرۆژەکان و کاتی جێبەجێ کردنیان بدات.

ژالیا، بە (نەوژین)ی وت: «لەگەڵ کۆمەڵێک گەنجی کەلاردا رێککەوتوین لەسەر ئەنجامدانی پرۆژە لەگەرمیان بۆ خزمەتکردنی کەسوکاری ئەنفالکراوەکان.»

# فەیم کۆچەری .. سیمبوڵی ژنانی ئەنفال

■ نەوژین،
زریان محەمەد – جوانە جەلیل

**(فەهیمە حەمەئەمین) ناسراو بە (فەیمە کۆچەری) ئەو ژنەی کە زیندانەکانی حکومەتی دیکتاتۆری بەعسی بینیوەو هەمو کەسوکارەکەی لە شاڵاوی ئەنفالدا لە دەست دەدات، لە ئێستاشدا لە کونجی خانویەکی نیمچە روخاو بۆ ماوەی (٢٨) ساڵە بە تەنها ژیان بەسەر دەبات. ئەو وەکو یەکێک لە سیما و سیمبوڵەکانی تاوانی ئەنفال لەکوردستان دەناسرێتەوە.**

حاجی فەیمی تەمەن (٦٣) ساڵ، لە ناحییەی رزگاری سەر بە قەزای کەلار دادەنیشێت، سەرگوزەشتەی خۆی بۆ (نەوژین) دەگێرێتەوەو دەڵێت: «من وەکو ژنیک تەواوی ژیانم لە شاخ بە سەر بردوە، شان بە شانی پیاوان پێشمەرگایەتیم کردوە، ئێستاشی لەگەڵ بێت بە هەمان گڕوتینی جارانەوە ئامادەم بەم تەمەنەوە دیسان چەک هەڵگرم و دژی داگیرکەرانی خاکی کوردستان بجەنگم».

وتیشی: «بەهۆی پێشمەرگە بونمانەوە هەمو خێزانەکەم هەڕەشەی حکومەتی بەعسمان لە سەر بو، بەڵام زۆری نەخایاند ئەوە بو لە ساڵی ١٩٨٧ لە ناوچەی (ملەسورە)ی گەرمیان کە بە پایتەختی ئەنفال ناسراوە، هەمو خێزانەکەم ئەنفال کران کە لە دایکم باوکم و(٣) براو (١)خوشک و (٩) برازام پێکهاتبون برایەکیشم شەهید بو بۆ دواجار خۆم بە تەنها مامەوە».

حاجی فەیم، باسی لەوەش کرد: «لە دوای لە دەستدانی خێزانەکەم بەیەکجاری بڕیاری ئەوەم دا کە تەواوی ژیانم لە پێشمەرگایەتی بەسەر ببەم، بەو هۆیەشەوە ژیانی هاوسەریم پێک نەهێنا».

وتیشی: «بە هۆی ئەوەی کە پێشمەرگە بوم چەندین جار لە لایەن ( فازل موختارەوە) ئەدرام بە دەستەوە، وەک خۆی دەڵێت: «ئیستا ١ ملیۆن دیناریان بۆ بڕیوتەوە ئەگەرچی کەسێکی وەک منی ئەدا بەدەستەوە».

فەیمە کۆچەری، درێژەی بە قسەکانی داو بۆ (نەوژین) وتی: «بەشداری راپەرینەکەی ساڵی ١٩٩١ کردوە وەک و پێشمەرگەیەک، بەو هۆیەشەوە بۆ ماوەی سێ جار رامکردوە بۆ وڵاتی ئێران، هەرجارەو بۆ ماوەی چەندین مانگ لەوێ ماومەتەوە، بۆ دواجار گەڕامەوە کوردستان و لە ناحییەی رزگاری جێگیربوم».

وتیشی: «لە دوای گەڕانەوەم بۆ کوردستان بەهۆی ئەوەی پێشمەرگە بوم (٣) جار زیندانی کراوم لە لایەن حکومەتی بەعسەوە، هەرجارەو بە هاوکاری هەریەک لە (عومەر یونس) موختاری ناحیەی رزگاری و (حەمە نەهیە) و (شێخ عەتای تاڵەبانی ) رزگار کرام».

حاجی فەیم، بەوتەی خۆی، (٥٠) ژیانی پێشمەرگەی لە سەردەمی رژێمی بەعسدا رزگار کردوە.



فەیمە کۆچەری، سەرەڕای ئەو هەمو خەباتەی کە لە رابردو هەیبوە، لەگەڵ ئەوەی تەواوی خێزانەکەی لە شاڵاوی ئەنفالدا لەستدەدات، دوای راپەرین تێکەڵ بەکاری سیاسیی و حزبی بوەو بۆ ماوەیەک کارگێڕی کۆمیتەی رێکخستنی رزگاری یەکێتی نیشتمانیی بوە.

سەرباری ئەمەش، لەزۆر چالاکی پەیوەندیدار بە ئەنفال و جینۆسایدی گەلی کوردستان دا رۆڵی هەبوە، ئەو نمونەی داکۆکیکردن لە دۆسیەی

> ناوی چەندین مەلام لایە کە دەستیان هەبوە لە کەیسی ئەنفالدا

(حاکم هاوژین) دێنێتەوەو دەڵێت: «بۆ پشتیوانی کردنی (حاکم هاوژین) رۆشتمە مەکتەبی رێکخستن تاوەکو هاوکاری بکەن لە دەستگیرکردنی موستەشارەکان، بەڵام هیچیان بۆ نەکردین».

وتیشی: «داوا دەکەم ئەو موستەشارانە دەستگیر بکرێن و بەسزا بگەیەنرێن»، وەکخۆی دەیڵێت: «ناوی چەندین مەلاشم لایە کە لە عێراق ئیمزایان کردوە دەستیان هەبوە لە کەیسی ئەنفالدا».

حاجی فەیم، لە ئێستادا لە خانویەکی هاوشێوەی کەلاوەدا ژیان بە سەردەبات، لەوبارەوە دەڵێت: «ئێستا لەم خانوەدا ئاسودەم کە ژیانم تێیدا دەگوزەرێنم، ئەگەر باسی خانو بکەم من چەندین خانوم هەیە، خانویەکیشم وەرمگرتوە و داومە بەماڵێکی هەتیو تاوەکو تیایدا بژین.»